# الشَّرحُ والإبانةُ على أُصُولِ السُّنَّةِ والدِّيانةِ ومُجانبةِ المُخالِفِينَ ومُبايَنةِ أهلِ الأهواءِ المارِقِينَ


أَبِي عَبدِ اللهِ عُبَيدُ اللهِ بنِ مُحَمَّدِ بطَّةِ العَكبَرِيِّ

(٣٧٨) هـ


# کتێبی الابانة الصغری بە کوردی




وەرگێڕ : عمر بن جعفر بن سليم الشاربازيري



١٠/رجب/١٤٤٣

# بِسْــــــــمِ اللّٰهِالرَّحْمَنِ الرَّحِيم

**پێشەکی:**

الحمدالله به فەزڵ و منەتی الله تعالى توانیمان کتێبی الشرح والإبانة على أصول السنة والديانة ومجانبة المخالفين ومباينة أهل الأهواء المارقين بکەینەوە به کوردی کە تەبعەن هیچ شتێك بێ هەڵەو کەموکوڕی نابێت، هەر هەڵەیەکمان کرد بوو لەلایەن خۆمانەوەیە الله لێمان خۆشبێت، بەهاوکاری کۆمەڵێ سوونی بەڕێز، لەنوسینەوە، ودیزاین کردن، وپێدا چوونەوە، الله پاداشتی خێریان بداتەوە، بۆیان بکاتە توێشوی قیامەت .

**تێبینی** : ئەونوسینانەی بەڕەنگی سور نوسراون قسەی خۆمە، وەمن تەئلیقم بۆ هیچ حەدیثێك نەکردوە کە إبن بطة رحمه الله هێناویەتی، کە صەحیح بن یان ضعیف، تەنها کردومەتەوە بەکوردی، وە من پێشەکیەکانی نووسەرم نەکردۆتەوە بەکوردی تەنها ئەثەرەکانم کردوە .

**نوسەر** : إبن بطة

**وەرگێر** : عمر بن جعفر بن سليم الشاربازيري

**پێدا چوو نەوە** : بدر خورماڵی

## (ژياننامەی ابن بەطۀ)

**ناو:** عُبيد الله بن محمد بن محمد بن حمدان بن عمر بن عيسى بن إبراهيم بن سعد بن عتبة بن فرقد هاوەڵی رسل الله صلى الله عليه وسلم .

**ساڵی لە دایک بوونی:** ٣٠٤ھ

**ساڵی مردنی:** ٣٨٧ھ

**کونیە:** أبو عبد الله العكبرى.

**مامۆستاکان:**

ابی بكر عبد الغزيز غُلام الخلال٣٦٣ھ

ابن صاعد٣١٨ھ

ابی بكر الاجوري ٣٦٠ھ

ابی بكر الباغندي ٣١٢ھ

ابن مخلد ٣٣١ھ

**تەلەبەکانی:**

ابو أسحاق البرمكي٣٦١ھ

ابن شهاب العُكبري ٤٢٨ھ

ابو حفص العُكبري ٣٨٧ھ

١ - لەوەی کە اللە عزوجل فەرمانی پێکردووە، لە کتێبەکەی خۆیدا باسی کردووە (قورئان): دەستگرتن بەجەماعەتی مووسڵمانان، وە نەهی کردووە لە دووبەرەکی، اللە تعالى دەفەرمووێت : {وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُو} [آل عمران : ١٠٣] .
اللە تعالى هەڕەشەی لەو کەسانە کردووە کە دووبەرەکی دەخەنە نێوان جەماعەتی موسڵمانانەوە : اللە تعالیٰ دەفەرمووێت : {وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخۡتَلَفُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ} [آل عمران : ١٠٥] اللە تبارك وتعالى فەرمانی کردووە بەکۆبوونەوە لەسەر دینەکەی، فەرمانی کردوە بەعیبادەت کردن بۆ خۆی. اللە عزوجل دەفەرمووێت : {وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ} [البينة : ٥]
اللە عزوجل دەفەرمووێت : {إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ} [الصف : ٤] .

ووتم : ئەمە مانای ئەوە نادات بەبیدعە و موبتەدیعەکان ڕازی بین و تەبەڕایان لێنەکەین، لەژێر ناوی نابێ دووبەرەکی بنێینەوە، جەماعەت ئەوەیە کەلەسەر حەق بیت، ئەگەر بێت و بەتەنهاش بیت، بەڵکو ئەوە ئەهلی بیدعەن کە دووبەرەکی و ناکۆکی دەنێنەوە .

٢ - اللە تعالى فەرمانی پێ کردوون بەموسڵمانان بە جودا بوونەوە لەوانەی پێچەوانەی بیروباوەڕیانن، وە تانە لەدینەکەیان دەدەن، فەرمانی پێکردوون بەوەی : کەلێیان دووربکەونەوە، و لەگەڵیان دانەنیشن، و گوێ لە هەڵە و قسەکانیان نەگرن، اللە تبارك وتعالى دەفەرمووێت : {وَقَدۡ نَزَّلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أَنۡ إِذَا سَمِعۡتُمۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكۡفَرُ بِهَا وَيُسۡتَهۡزَأُ بِهَا فَلَا تَقۡعُدُواْ مَعَهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦٓ إِنَّكُمۡ إِذٗا مِّثۡلُهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا} [النساء : ١٤٠] .

٣ - رسول الله ﷺ فەرمانی کرد بەو سێ کەسەی کە دواکەوتن لێی : بەهەجرکردنیان، و ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لە حاڵیان، وە فەرمانی کرد بەوەی کە ئافرەتەکانیان لێ بسەندرێتەوە هەتا الله عزوجل تەوبەی ئەوانی دابەزاند .

ووتم : ئەم سێ کەسەی کەپێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بەهەجرکردنیان، سێ کەس بوون لە إصحاب ی خۆی، کە دوای ئەوەی دەرچوون بۆ غەزایەك لەگەڵ پێغەمبەر دا ﷺ نەهاتن، پێغەمبەر یش ﷺ بەم جۆرەی لەگەڵداکردن لەبەرئەوەی ترسی نیفاقی لێیان هەبوو، وە ئەم سوننەتە مایەوە لە ناو أصحاب ی رسول الله ﷺ و جیلی دواتر و جیلی دواتردا هەتا سەردەمی ئێمەش، کە هەرکەسێك لە بیدعەیەکدا تێبکەوێت، یاخود لە گومڕایەکدا تێبکەوێت، پێویستە لەسەرمان هەجری بکەین هەتاوەکو لەو بیدعەیەی دەگرێتەوە و ئاشکرای دەکات کەلێی گەڕاوەتەوە .

٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : یەکەم کەم و کورتیەک کە چووە ناو بني إسرائيل: ئەوەبوو کاتێك پیاوێك بەبراکەی دەگەیشت پێی دەووت :تۆ لە الله بترسە، واز لەوەبێنە کە دەیکەیت، ئەوە بۆ تۆ حەڵاڵ نییە. دواتر کەبەیانی دەیبینییەوە، ئەوە رێگری لێ نەدەکرد کە خواردنی لەگەڵ بخوات و خواردنەوەی لەگەڵ بخواتەوە و لەگەڵی دابنیشێت، کاتێك ئەمەیان دەکرد : تاوەکو الله دڵی بەیەکدا دان. الله تعالی دەفەرمووێت : {لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ} [المائدة : ٧٨]{وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ} [المائدة : ٨١] .

ووتم : دڵی هەندێکیانی دابەیەکدا، مەبەست لێی ئەوەیە دڵی هەندێکیانی گۆڕی بەرامبەر هەندێکیان کەوای لێکردن رقیان لەیەك ببێتەوە، رقی خستە نێوانیانەوە.

٥ - رسول الله ﷺ : نمونەیەکی زۆر جوانمان بۆ دەهێنێتەوە کەدەفەرمووێت : کۆمەڵانێك هەن کەلەسەر سنورەکانی الله تعالی دەوەستن و پارێزگاری لێ دەکەن، سنورەکانی الله تعالی دەپارێزن، وە کۆمەڵانێکیش هەن کەسنورەکانی الله تعالی ناپارێزن و فێڵ و تەڵەکەی تێدا دەکەن بۆئەوەی کەهۆکارێك بدۆزنەوە بیبەزێنن، ئەم دووانە نمونەیان وەکو دوو کۆمەڵە وایە کەلە کەشتیەکدان، کەشتیەکە دووقاتە، کۆمەڵەیەکیان لە سەرەوە دەبن، کۆمەڵەکەی ترشیان لە خوارەوە دەبن، ئەوانەی خوارەوە ئەگەر ئاویان بووێت لە ڕووبار دەریبهێنن پێوویستە سەربکەون و لە ڕووبارەکە دەریبهێنن و بچنەوە خوارەوە،ئەمەش ئەوانی سەرەوە نارەحەت دەکات بۆیە ئەوانیش دەڵێن : خوارەوەی کەشتیەکە کوندەکەین گەر ڕێگەمان پێنەدەن بێینە سەرەوە بۆ بەدەست هێنانی ئاو، ئەوانەی سەرەوەش ئەگەر ڕێگریان لێکردن لەوەی ئەم کارەبکەن ئەوا هەردوو کۆمەڵەکە ڕزگاریان دەبێت، بەڵام ئەگەر ڕێگریان لێ نەکردن ئەوا کەشتیەکە کون دەبێت و هەردوو کۆمەڵەکە نوقم دەبن .

ووتم : ئەو کەسانەی پارێزگاری لە سنورەکانی الله تعالی دەکەن، پێویستە فەرمان بەئەوانی تریش بکەن کەلەسەر سنورەکانی الله تعالی بووەستن و نەیبەزێنن، ئەگەر فەرمانیان پێنەکردن و وازیان لێهێنان سنوورەکانی الله تعالی ببەزێنن ئەوا ئەوانیش لەگەڵ ئەواندا لەناودەچن.

٦ - پێغەمبەر رسول اللهﷺ دەفەرمووێت : بەنو ئیسرائیل بوون بەحەفتاو دوو فیرقەوە، وە ئومەتەکەی من دەبێت بە حەفتاو سێ فیرقەوە، یەك فیرقەیان ڕزگاری دەبێت، وە حەفتاو دوو فیرقەکەی تر لەئاگردان .

٧ – وە دەفەرمووێت ﷺ : وەسێتان بۆ دەکەم بەدەستگرتن بەسوونەتەکانی منەوە وە سوننەتی خولەفا ڕاشیدینەکان ئەوانەی لەدوای منەوە دێن (أبو بکر

صديق، عمر بن خطاب، عثمان بن عفان، على بن أبو طالب) رضي الله عنهم، وه قەپی پێدابکەن بەخرێکانتان (بە ددانەکانتان) .

٨ - دەفەرمووێت ﷺ : بۆم هێناون بەسپێتی و بەپاکی، لەدوای من جیاوازیتان تێنەکەوێت .

٩ - دەفەرمووێت ﷺ : ئێوەم بەجێهێشتووە لەسەر دینێکی ئاشکرا، بەلای ڕاست و بەلای چەپدا مەڕۆ .

١٠ - دەفەرمووێت ﷺ : بەڕاستی الله بەندە دەخاتە بەهەشت بە سوننەتێک کە دەستی پێوە گرتووە .

١١ - دەفەرمووێت ﷺ : والله ی ئەگەر موسی و عیسی علیهم الصلاة والسلام لە ژیاندا بوونایە بۆیان حەڵاڵ نەبوو ئیللا شووێنکەوتنی من نەبێت .

١٢ - دەرچوو بۆلای هاوەڵەکانی ﷺ ئەوان موناقەشە و بەربەرەکانیان دەکرد لەقەدەردا، فەرمووی پێیان: من بەمە فەرمانم پێکردوون؟! ئایا من ڕێگریم لێ نەکردوون لەمە؟! بەڕاستی قەومەکانی پێش ئێوە بەم بەربەرەکانی و موناقەشەکردنە لەناوچوون .

١٣ - ڕۆژێک ﷺ دەرچوو بۆلای هاوەڵەکانی وە هاوەڵەکانی دەیانووت : ئایا الله تعالى وای نەووتووە وە ئایا الله تعالى وای نەووتووە؟ ئەمەیان دەووت بۆ ڕەدانەوەی یەکتر، رسول الله ﷺ توڕەبوو وەک ئەوە وابوو دەنکە هەنار بە

دەمووچاویدا تەقێنرابێت، فەرمووی : ئومەتەکانی پێشوو بەمە تیاچوون، هەندێکی کتێبی الله تعالی مەدەن بەگژ هەندێکی تریدا، بەڕاستی ئەوە شك و گوومان لە دڵەکاندا درووست دەکات .

١٤ - دەفەرمووێت ﷺ : لەگەڵ قەدەریەکاندا دامەنیشن، ئەوان بەربەرەکانی و موناقەشە لە ئایەتەکانی الله عزوجل دا دەکەن .

١٥ - دەفەرمووێت ﷺ : موناقەشەکردن و بەربەرەکانی کردن لەقورئاندا کوفرە .

١٦ - دەفەرمووێت ﷺ : ئێوە بە هیچ شتێك بۆلای الله تعالی ناگەڕێنەوە بە باشتر بەوەی کەلێی دەرچووە. (قورئان) .

١٧ - دەفەرمووێت ﷺ : قورەیش ڕێگریان لێکردم کە کەلامی الله بگەیەنم.

١٨ - بە جابر دەفەرمووێت ﷺ : زانیومە کە الله باوکتی زیندووکردۆتەوە و قسەی لەگەڵ کردووە بەبێپەردە .

ووتم : ئەمانە هەموو دەبنە دەلیل و بەڵگە بۆ ئەوەی کە قورئان کەلامی الله تعالی یە و مەخلوق نییە، وە الله تعالی قسە دەکات بە پیت و حەرف.

١٩ - دەفەرمووێت ﷺ : لەدوای من کۆمەڵە فیتنەیەك ڕوودەدەن پیاو بەیانی دەکاتەوە مووسڵمانە، ئێوارەی بەسەردادێتەوە کافرە، ئێوارەی بەسەردادێتەوە

مووسڵمانە بەیانی دەکاتەوە کافرە، ئیللا ئەگەر کەسێك الله تبارك وتعالى زیندووی کردبێتەوە بە فێربوونی علم .

٢٠ - دەفەرموویت ﷺ : دەست بەوانەی دوای منەوە بگرن : أبي بكر وعمر رَضِي الله عَنهما .

٢١ - دەفەرموویت ﷺ : بەنی ئیسرایل بەڕێکی و بەڕاستی دەڕۆشتن هەتا منداڵانی دایکە سەبایەکان تێیاندا دەرکەوت (ئەو ئافرەتانە بوون کە لە بەنی ئیسرائیل نەبوون منداڵەکانی ئەوان تێیاندا دەرکەوتن)، بەبۆچوونی ئەوان دینیان وەرگرت وازیان لە سوننەت هێنا .

٢٢ - دەفەرموویت ﷺ : الله عیلم لەناو سنگی پیاوەکاندا هەڵناگرێتەوە، بەڵکو عالمەکان دەباتەوە بۆلای خۆی، کاتێك کەهیچ عالمێك نەما، خەڵکی پرسیار لەسەرانی گومڕایی دەکەن، ئەوانیش فتوایان بەغەیری علم بۆ دەدەن، گومڕادەبن و گومڕادەکەن .

٢٣ - رسول الله ﷺ نەهی کردوە لە : ووتی ووتی، وە بە فیرِۆدانی پارە، وە پرسیار زۆرکردن،

ووتم :مەبەست لەمە ئەوەنییە کە کەس بۆی نیە پرسیاربکات سەبارەت بەدینەکەی بۆئەوەی فێربێت، بەڵکو مەبەست لەوەیە کەشتەکان زۆر ووردبکەنەوە، رسول الله ﷺ نەهی لەوەکردووە کە شتەکان زۆر ووردبکەنەوە.

٢٤- رسول الله ﷺ رِقی لەزۆر پرسیارکردن بووە .

٢٥ - نەهی کردووە ﷺ لە پرسیارکردنانێك کەپەیوەندی نەبێت .

٢٦  ووتراوە: ئەوە توندترینی مەسئەلەکانە و قوورسترینیانە .

٢٧ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : وازم لێ بهێنن مادام من وازم لێ هێناوون .

٢٨ - دەفەرمووێت ﷺ : گەورەترین تاوانی مووسڵمان بەرامبەر مووسڵمانان ئەوەیە : کە پرسیار لەشتێك بکات کە حەرام نەکراوە، حەرام دەکرێت بەهۆی پرسیارکردنەکەی ئەوەوە .

ووتم : لە سەردەمی رسول الله دا ﷺ هەندێك شت هەبوون (رێپێدراوبوو)، هیچ ئایەتێکی لەسەر دانەبەزیبوو، رسول الله ﷺ فەرمووی : بە ووردکردنەوە و پرسیارکردن لەبراکانتانی حەرام مەکەن، چونکە دوای پرسیارکردن لەرسول الله ﷺ وەحی دادەبەزێت .

٢٩ - دەفەرمووێت ﷺ : هەرکەس شتێك دابهێنێت یاخود بچێتە ناو داهێنراوێکەوە ئەوە لەعنەتی الله ی لێبێت، وە لەعنەتی لەعنەتکارانی لێبێت، وە مەلائیکەتەکان، وە هەموو خەڵکی، الله تعالی هیچ شتێکی لێ قەبوڵ ناکات الله تعالی هیچ فەرزێك و زیادەیەکی لێ قەبوڵ ناکات .
بە الحسنیان ووت : داهێنراو چییە؟
ووتی : هاوەڵانی فیتنە هەموویان داهێنەرن، وە ئەهلی ئەهواء هەموویان داهێنەرن .

٣٠ - دەفەرمووێت ﷺ : ئەهلی بیدەع : سەگی ناو ئاگرن .

٣١ - دەفەرمووێت ﷺ : هەرکەس بیدعەچیەک بە گەورە ڕابگرێ ، ئەوە یارمەتی داوە لەڕووخاندنی ئیسلامدا .

٣٢ - ابنُ مسعود ﴿٣٢هـ﴾رَضِي اللّٰهُ عَنهُ دەڵێ :ڕۆژێك رسول الله ﷺ هێڵێکی ڕاستی بۆ کێشاین، فەرمووی : ئەمە ڕێگای الله یە، دوواتر بەلای چەپ و ڕاستی هێڵە ڕاستەکەدا کۆمەڵە هێڵێکی تری کێشا، وە فەرمووی :هەموو ئەمانە ڕێگەی ترن، لەسەر هەر ڕێگایەکیان شەیتانیك هەیە کە دەعووە دەکات بۆ ئەم ڕێگایە، دواتر ئەم ئایەتەی خووێندەوە { وَأَنَّ هَـٰذَا صِرَ ٰطِی مُسۡتَقِیمࣰا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِیلِهِۦۚ} [الأنعام : ١٥٣] .

واتە : ئەو هێڵانەی کە رسول الله ﷺ لەلای ڕاست و لەلای چەپەوە کێشای .

٣٣ - عائشة ﴿٥٨هـ﴾ رضي الله عنها دەڵێ: رسول الله ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە : {هُوَ ٱلَّذِیۤ أَنزَلَ عَلَیۡكَ ٱلۡكِتَـٰبَ مِنۡهُ ءَایَـٰتࣱ مُّحۡكَمَـٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَـٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَـٰبِهَـٰتࣱۖ فَأَمَّا ٱلَّذِینَ فِی قُلُوبِهِمۡ زَیۡغࣱ فَیَتَّبِعُونَ مَا تَشَـٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَاۤءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَاۤءَ تَأۡوِیلِهِۦۖ} [آل عمران : ٧] .

ووتی : گوێم لە رسول الله بووە ﷺ فەرموویەتی : ئەگەر ئەوانەتان بینی موجادەلە دەکەن لەقورئاندا ئەوە ئەوانەن کە الله ناویناون ئاگاداریان بن .

٣٤ - دەفەرمووێت ﷺ : قەومێك دوای ئەوەی هیدایەت درابوو هیچ شتێك گومڕای ناکات ئیللا مناقەشە کردن نەبێت، دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە : {مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢاۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ } [الزخرف : ٥٨] .

٣٥ - دەفەرمووێت ﷺ : دەستگرتوو بەسوننەتی منەوە لەکاتی خراپبوونی ئومەتەکەم پاداشتی پەنجا شەهیدی هەیە .

٣٦ - دەفەرمووێت ﷺ : کەسی دەستگرتوو بەدینەکەیەوە لەکاتی خراپبوونی خەڵکدا وەك کەسێکە دەستیگرتبێت بە پشکۆوە .

٣٧ - دەفەرمووێت ﷺ : ئەو کەسەی دەستی بە دینەکەیەوە گرتووە لە هەرجا (ڕۆژانی کوشت و کوشتار) وەك ئەو کەسە وایە کەهیجرەتی کردووە بۆلای من .

٣٨ - دەفەرمووێت ﷺ : ئیسلام بە غەریبی دەستی پێکرد، وە غەریب دەبێتەوە وەك چۆن سەرەتا بە غەریبی دەستی پێکرد، خۆشبەختی بۆ غەریبەکان .
وتیان یا رسول الله ﷺ غەریبەکان کێن؟
فەرمووی ﷺ : ئەوانەن کەخەڵکی خراپبوون ئەوان باش دەبن .

٣٩ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : الله لەهاوەڵەکانم، قسەیان پێ مەڵێن لەدوای من، هەرکەس خۆشی بووێن بە خۆشەویستی ئەوان منیش خۆشم دەوێت، هەرکەس ڕقی لێیان بێت بە ڕق لێبوونەوەی ئەوان منیش ڕقم لێ دەبێت، وە هەرکەس ئازاری ئەوان بدات ئەوە ئازاری منی داوە، وە هەرکەس ئازاری من بدات ئەوە ئازاری الله ی داوە، وە هەرکەس ئازاری الله بدات نزیکە الله بیگرێت .

٤٠ - دەفەرمووێت ﷺ : جنێوو بەهاوەڵانم مەدەن، سووێند بەو زاتەی کە نەفسی منی بەدەستە ئەگەر ئێوە بەقەدکێووی ئوحد ئاڵتون ببەخشن ناگاتەوە بەبەخشینی مشتێکی ئەوان، یاخود نیوو مشتی ئەوان.

٤١ - معاذ بن الجبل ﴿١٨ھ﴾ رضي الله عنه دەڵێ :رسول الله ﷺ پێی ووتم : ئەی معاذ، گوێڕایەڵی هەموو ئەمیرێك بکە، نوێژ بکە لەدوای هەموو ئیمامێکەوە، وە جنێوو بەهیچ کام لەهاوەڵانم مەدە.

٤٢ - رسول الله ﷺ دەستی لەسەر ڕیشی عمر بن خطاب رَضِيَ اللَّهُ عَنه دانا، دواتر فەرمووی : ئەی عمر (ئێمە هی الله ین و بۆلای الله یش دەگەڕێینەوە) عمر رَضِيَ اللَّهُ عَنه ووتی : بەڵێ، بە دایك و باوکەوە بەقوربانتبم یا رسول الله ﷺ، ئێمە هی الله ین و بۆلای الله دەگەڕێینەوە، ئەمە مانای چییە؟
فەرمووی ﷺ : جبریل هات بۆلام علیه السلام پێی ووتم :ئەی محمد ﷺ ئێمە هی الله ین و بۆلای الله یش دەگەڕێینەوە، ئومەتەکەت دوای ڕۆشتنی تۆ بە کەمێك توشی فیتنە دەبن.
رسول الله ﷺ فەرمووی : ووتم ئەی جبریل ئایا فیتنەکانیان گومڕاییە یاخود کوفرە؟
ووتی : هەموویانە.

رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : ووتم چۆن گومڕا دەبن و کافر دەبن، کە من لەدووای خۆم کتێبی الله یان بۆ بەجێدەهێڵم؟
ووتی : بە کتێبی الله گومڕا دەبن، هەر قەومێك بە هەواو ئارەزووی خۆی تەئویلی دەکات و ئەوەش گومڕایان دەکات .

ووتم : بۆیە ئەبێت بگەڕێینەوە بۆ تێگەشتنی سەلەف، ئەوەی نەگەڕێتەوە بۆ تێگەشتنی سەلەف، توشی کوفر و گومڕای دەبێت .

٤٣- الحسن البصري ﴿١١٠هـ﴾ رحمه الله دەڵێ :رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : هاوڵانم بەوێنەی خوێن لەناو خواردندا، نزیکە خوێ قەومەکەم بڕوات.

٤٤ - رسول الله ﷺ هاتە مزگەوتەوە أبي بكر رَضِي الله عَنه لای ڕاستی و عمر رَضِي اللّٰهُ عَنه لای چەپییەوە بوون، فەرمووی : ئاوا زیندوو دەبینەوە لەڕۆژی قیامەت ئاواش دەچینە بەهەشتەوە .

٤٥ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : هیچ پێغەمبەرێك نییە ئیللا دوو وەزیری هەیە لەئەهلی ئاسمان و لەئەهلی زەوی، وەزیرەکانی من لەئەهلی ئاسمان جبریل و میکائیل ـن، وە وەزیرەکانم لەزەوی أبي بكر و عمر ـن رَضِي اللّٰهُ عَنهما.

٤٦ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : خۆشەویستی چوار کەس لەدڵی هیچ کەسێکدا جێگیر نابێت ئیللا ئەوکەسە ئیماندارە و لە الله دەترسێت : أبي بكر، وعمر، وعثمان، وعلي رَضِي الله عنهم.

٤٧ - دەفەرمووێت ﷺ : الله فەرزی کردووە لەسەرتان خۆشویستنی : أبي بكر، وعمر، وعثمان، وعلي رَضِي الله عَنهم، هەروەك چۆن فەرزی کردووە لەسەرتان : نوێژ، زەکات، ڕۆژ، حەج، هەرکەسێك ڕقی لەیەکێك لەوان بێت، الله دەیخاتە ئاگرەوە.

٤٨ - دەفەرمووێت ﷺ : هەرکەس جنێوو بەهاوەڵانم بدات لەعنەتی الله ی لێبێت، وە لەعنەتی لەعنەتکارانی لێبێت، وەلەعنەتی مەلائیکەتەکانی لێبێت، وە هەموو خەڵکی.

٤٩ - دەفەرموویّت ﷺ : جنیّوو بە هاوەڵانم مەدەن، قەومانیّك دیّن لە كۆتای زەماندا جنیّوو بە هاوەڵانم دەدەن، نوێژیان لەسەر مەكەن، وە نوێژیان لەپشتەوە مەكەن، وە هاوسەرگیریان لەگەڵدا مەكەن، وە لەگەڵیان دامەنیشن، وە ئەگەر نەخۆش كەوتن سەردانیان مەكەن.

٥٠-إبن عباس ﴿٦٨هـ﴾ رضي الله عنه دەڵێ :جنیّوو بەهاوەڵانی محمد ﷺ مەدەن، الله عز وجل فەرمانی كردووە بەوەی داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بكرێت، وە ئەو دەیزانی كە ئەوان لەیەكتر دەكوژن.

٥١ - عائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنها دەڵێت : فەرمانكراوە بەداوای لێخۆشبوون كردن بۆ هاوەڵانی رسول الله ﷺ، كەچی جنیّوویان پێ دەدرێت.

٥٢ - أبو بكر الصديق رَضِيَ اللَّهُ عَنه دەفەرموویّت : چ ئاسمانێك سەقفم بێت، وە چ زەویەك هەڵم دەگرێت ئەگەر شتێكم ووت لە كتێبی الله تعالی دا كە نەمدەزانی .

٥٣ - أبو بكر الصديق رَضِيَ الله عنه دەفەرموویّت : سوننەت گوریسی بەهێزی الله یە، هەركەس وازی لێبهێنێت، ئەوە ئەو گوریسەی لەنێوان خۆی و الله دا پچڕاندووە.

٥٤ - عمر بن الخطاب ﴿ ٢٣ هـ ﴾ رَضِيَ اللَّهُ عَنه دەفەرموویّت : هاوەڵانی ڕەئی دووژمنی هاوەڵانی سوننەن، ئەوان حەدیث ەكان لەبەرناكەن، جا حەدیث

ەكانیان لەدەست دەچێت، ئینجا بە ڕەئی فتوا دەدەن، گومرادەبن و گومڕائەکەن.

٥٥ - عمر رَضِي الله عَنه دەفەرمووێت : قورئان کەلامی الله یە عزوجل،مەیخەنە پاڵ غەیری الله عزوجل.

٥٦ - عمر رَضِي اللهُ عَنه دەفەرمووێت : الله عزوجل هیچ فەرمانێکی نەکردووە ئیللا ئەوەی خێری تێدایە بۆ ئیمانداران، وە لەهیچ شتێك ڕێگری لێنەکردوون ئیللا ئەوە زەرەری تێدایە بۆ ئیمانداران.

٥٧ - عثمان بن عفان ﴿ ٣٥ ه ﴾ رَضِي اللهُ عَنه دەڵێیت : بەتاڵ ئەوەیە کە نەفس موافەقەتی دەکات وە الله عزوجل فەرمان بە هەر شتێك بکات ئەوە تاعەتی الله یە.

٥٨ - علي بن أبي طالب ﴿ ٤٠ ه ﴾ رَضِي اللهُ عَنه دەڵێیت : هەواو ئارەزوو ڕێگری دەکات لەحەق .

٥٩ - علي كرَّم الله وجهه دەڵێیت : هەوا لەلای کەسێك کەموخالەفەی سوننەت بکات حەقە ئەگەر بێتوو لە مل یشی بدرێت لەسەر ئەوە.

٦٠ - ابن عباس رَضِي اللهُ عَنهما دەڵێیت : هەندێکی کتێبی الله مەدەن بەگژ هەندێکی تریدا.

٦١ - عمر رَضِي اللهُ عَنه جەڵدى صبيغ التميمي كرد لەسەر بابەتێك سەبارەت بەقورئان.

| ووتم : صبيغ التميمي قسەی لە مووتەشابیهەکانی قورئاندا دەکرد لەسەر ئەوە الامام عمر جەلدی کردووە. |
|---|

٦٢ - إبن مسعود (٣٢هـ) رضي الله عنه دەڵێ: ئەگەر پێت وترا الله تعالی ئاوا و ئاوا دەفەرمووێت، ئەوا بەباشی گوێبگرە، یان ئەوەتا خێرێکە فەرمانت پێ دەکات ئەنجامی بدەیت، یان ئەوەتا شەڕێکە ڕێگریت لێدەکات لەئەنجامدانی .

٦٣ - ابن مسعود رضي الله عنه دەڵێ : قورئان کەلامی الله عزوجل ە هەر کەس قسەیەك بکات لەسەری ئەوە لەسەر الله ی کردووە عزوجل.

٦٤- إبن عمر ﴿٧٣هـ﴾ رضي الله عنهما : هەرکەس واز لە سوننەت بێنێت کوفری کردووە.

| ووتم : وازهێنان لە سوننەت دوو جۆرە:<br>١ - وازلێهێنانی کوفرە: ئەویش ئەبوابە ئیعتیقادیەکان دەگرێتەوە.<br>٢ - کە کوفر نییە: ئادابەکان و هەڵسوکەوتەکانە، کە بە ئەنجامدانی پاداشتت دەست دەکەوێت. |
|---|

٦٥- عمر بن عبد العزيز ﴿١٠١هـ﴾ عیلم بون بەسونەت ئەوەیە کەبزانی چی توشی خیلافت ئەکات لەگەڵیدا، وە هاوەڵان زۆر لەئێوە شارەزاتربون ئەگەر بیان زانیایە جێی موناقەشە و موجادەلەیە ئەوە تێیاندا ئەکرد .

٦٦ - پیاوێك به ابن عباس ی ووت رضي الله عنهما : الحمد لله كه الله ئارەزووی ئێمەی لەسەر ئارەزووی ئێوە داناوە ( واتە موافقەی ئارەزووی ئێوەی كردووە و ئارەزوومان شوێن ئێوە كەوتووە ). ابن عباس یش ووتی : الله عزوجل هیچ خێرێكی دانەناوە لەم ئەهوائانەدا، هەر بۆیە ناونراوە ئەهواء، چونكە خاوەنەكەی فڕێ دەداتە ناو ئاگرەوە .

٦٧ - الحسن، مجاهد بن جبر ﴿ ١٠٤ ھ ﴾، أبو العالية ﴿ ٩٣ ھ ﴾ (الرياحي) رحمهم الله دەڵێن : لەبەر ئەوە ناونراوە هەواء، چونكە هاوەڵەكەی فڕێ دەداتە ناو ئاگرەوە.

٦٨ -الحسن دەڵێ : هیچ دەردێك نییە قورستر بێت لە ئەهواء كە تووشی دڵ دەبێت.

٦٩ - أبو قلابة ﴿ ١٠٤ ھ ﴾دەڵێ : ئاگاداری ئەو كەسانەبن كە مووجادەلە و بەربەرەكانی دەكەن، من لێتان دڵنیانیم كە نەتانكەنە ناو گومڕاییەكەی خۆیانەوە، یاخود ئەوەی ئەوان دەیزانن بەشێك لەوە ببەخشن بەئێوە، دوای ئەوەی لێتان جیائەبنەوە .

٧٠ - عطاء ﴿ ١١٤ ھ ﴾ طاووس ﴿ ١٠٦ ھ ﴾ ، مجاهد، الشعبي ﴿ ١٠٣ ھ ﴾، إبراهيم ﴿ ٩٦ ھ ﴾ رحمهم الله رقیان لێ بووە كە فتوا بدەن لە مووجادەلە و مووناقەشەكردندا، وە دەڵێن : مووجادەلە و مووناقەشە دین دەكوژێنێتەوە، وە دەڵێن : هیچ كەسێك مووجادەلە و مووناقەشە ناكات ئیللا ئەو كەسە وەرعی نامێنێت.

٧١ - عمران بن الحصين ﴿٥٤هـ﴾ رضي الله عنه دەڵێ :: شەرم و حەیاء لە ئیمانە. پیاوێکیش پێی دەڵێت لەو کاتەدا لای ئەوە : لەم کتێبەی لای مندا نوسراوە شەرم و حەیاء هەندێکی لاوازیە وە هەندێکی شکۆمەندیە.
عمران ووتی : من بۆت دەگێڕمەوە لە رسول الله وە ﷺ، تۆش دەڵێیت لە کتێبەکەی مندا وانوسراوە؟! هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم.

٧٢ - لەمەجلیسێکی عمران بن حصین رضي الله عنه حەدیثێك باسکرا، پیاوێکیش ووتی : ئەگەر ئایەتێکی قورئانتان بخوێندایەتەوە لەم حەدیثەتان باشتر بوو، عمران وتی تۆ گێلی، ئایا چۆنیەتی نوێژ ڕوونکراوەتەوە لە قورئاندا ئایا چۆنیەتی زەکات ڕون کراوەتەوە لەقورئاندا ؟ قورئان سابتی دەکات، سوننەت ڕوونی دەکاتەوە .

٧٣ - المقدام بن معدي کرب ﴿٨٧هـ﴾ رضي الله عنه دەڵێ :: رسول الله ﷺ لە رۆژی خەیبەردا کومەڵێك شتی حەرام کرد، فەرمووی : خەریکە پیاوانێك دێن کە لەسەر جێگاکانیان شانیان داداوە، وە فەرمانەکانی من دێت بۆ لایان لەوەی کە فەرمانم پێکردووە لەوەی کە نەهیم لێکردووە، دەڵێ : وازبێنن لەمانە، نازانین ئەمانە چییە، دەست بگرن بە کتێبی الله عزوجل ەوە، وە من هیچ پیاوێك لە ئێوە ناناسم.

٧٤ - پیاوێك بە إبن عمر ی ووت رضي الله عنهما : ڕەئیت چۆنە؟ ڕەئیت چۆنە؟
پێی ووت : ڕەئی من بخە لای ڕاستەوە، دەست بگرە بە سوننەتەوە.

٧٥ - الشعبي ﴿١٠٣هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : هەرگیز ڕەئی خۆم بەرز نەکردۆتەوە.

٧٦ - قتادة ﴿١١٨هـ﴾ دەڵێ : سی ساڵە فتوام بەڕەئی خۆم نەداوە.

٧٧- الحسن رحمه الله دەڵێ : خراپترینی عەبدەکانی الله ئەوانەن کە دوای خراپترینی مەسئەلەکان دەکەون، بۆ ئەوەی عەبدەکانی الله ی پێ گومڕا بکەن.

٧٨ - میمون بن مهران ﴿١١٧هـ﴾ رحمه الله لە تەفسیری کەلامی الله عزوجل دەڵێ : {فَإِن تَنَازَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ} [النساء : ٥٩] بیگێڕنەوە بۆ لای الله بۆ لای کتێبەکەی، وە بیگێڕنەوە بۆ لای رسول ەکەی ﷺ : ئەگەر وەفاتی کرد بۆ لای سوننەتەکەی.

٧٩ - عكرمة ﴿١٠٥هـ﴾ رحمه الله دەڵێ :لەتەفسیری {وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ} [النساء: ٥٩]، دەڵێ : أبي بكر و عمر رضي الله عنهما .

٨٠ - يحيى بن أبي كثير ﴿١٣٠هـ﴾ رحمه الله دەڵێ :سوننەت دادوەرە بەسەر قورئانەوە، بەڵام قورئان دادوەر نییە بەسەر سوننەتەوە.

٨١ - حسان بن عطية رحمه الله دەڵێ : جبريل عليه السلام سوننەتی بۆ رسول الله ﷺ دادەبەزاند هەر وەکو چۆن قورئانی بۆ دادەبەزاند، وە سوننەتی فێردەکرد هەروەکو چۆن قورئانی فێردەکرد.

٨٢ - سعيد بن جبير ﴿٩٥هـ﴾ رحمه الله لەسەر ئەم ئایەتەی الله عزوجل دەڵێ : {وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ} [طه : ٨٢]، دەڵێ : دەستگرتن بە سوننەت و جەماعەتەوە.

٨٣ - دەگێڕێتەوە عُبيد الله، دەڵێ : لە أبو علي إسماعيل بن محمد الصَّفار، دەگێڕێتەوە دەڵێ : أحمد بن منصور الرَّمادِي، دەگێڕێتەوە دەڵێ : لە عبد الرَّزاق، دەڵێ : لە معمر، قتادة سەبارەت بەم ئایەتە دەڵێ : {وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِ} [الأحزاب : ٣٤]، قورئان و سوننەت.

٨٤ - دەڵێ : دەگێڕێتەوە أبو عبد الله أحمد بن علي بن علاء الجوزجاني، دەڵێ : دەگێڕێتەوە لە عبد الوهاب الورَّاق الشيخ الصالح، دەڵێ : دەگێڕێتەوە لە أبو مُعاوية، لە الأعمش، لە مُجاهدِ، دەڵێ : باشترین عیبادەت ڕەئی باشە واتە : سوننەت.

٨٥ - إسحاق بن عيسى دەڵێ : گوێم لە مالك بن أنس بوو جیدال و مووناقەشەی عەیبدار دەکرد لە دیندا، وە دەی ووت : هەرکاتێك پیاوێك بکەوێتە مووجادەلە و مووناقەشە لەگەڵ پیاوێکی تردا ئیللا واز لەوە دێنێت کە جبریل بۆ محمد ی هێناوە ﷺ.

٨٦ - إبن سيرين ﴿١١٠هـ﴾ رحمه الله دەڵێ :هیچ پیاوێك نییە کە بیدعەیەك وەربگرێت دوای ئەوە بگەڕێتەوە بۆ سوننەت.

٨٧ - عامر بن عبد الله رحمه الله دەڵێ : هیچ کەسێك نییە تووشی بیدعەیەك بێت، ئیللا بەیانی قسەیەك دەکات کە ئەمڕۆ ئینکاری لێکردووە.

٨٨ - إبن عون ﴿١٥١هـ﴾ رحمه الله دەڵێ :ئەگەر ئەهواء بەسەر دڵێکدا زاڵ بوو ئەوەی پێشتر بەخراپی دەزانی ئێستا بەباشی دەزانێت.

٨٩ - الفضيل بن عياض ﴿١٨٧هـ﴾ رحمه الله دەڵێ: بەندە لە باشیدایە هەتا ئەو کاتەی ئەو شتەی دوێنێ پێی خراپ بووە ئەمڕۆ پێی باشبێت.

٩٠ - أبو العالية رحمه الله دەڵێ : دوو ئایەت هەیە لە کتابی الله ‌دا کە زۆر قورسن لەسەر ئەوانەی کە موجادەلە دەکەن لە قورئاندا: {مَا يُجَادِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ} [غافر : ٤]
{وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِي ٱلۡكِتَٰبِ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ} [البقرة : ١٧٦]

٩١ - أطارة بن منذر رحمه الله دەڵێ : ئەگەر کوڕەکەم فاسقێك بێت لە فاسقەکان، خۆشەویسترە لەلام لەوەی کە ئەهلی ئەهواء بێت.

٩٢ - أبو إسحاق فزاري رحمه الله دەڵێ : ئەگەر دابنیشم لە مەجلیسی نەصرانیەکاندا لەناو کڵێسەکەیاندا، خۆشەویسترە لەلام لەوەی کە لە مەجلیسێکدا دابنیشم کە خەڵکی بەربەرەکانی و مووجادەلەی تێدادەکەن لە دینەکەیان.

٩٣ - سعيد بن جبير رحمه الله دەڵێ : ئەگەر کوڕەکەم هاوڕێیەتی کەسێکی فاسقی ئەهلی سوننە بکات، لام خۆشەویسترە وەك لەوەی هاوڕێیەتی کەسێکی عیبادەتکاری موبتەدیع بکات .

٩٤ - مالك بن مغول ﴿١٥٩هـ﴾ رحمه الله ووترا : کوڕەکەتمان بینی یاری بە باڵندە دەکات
ووتی : چاکترە ئەگەر سەرقاڵی بکات لەوەی هاوڕێیەتی موبتەدیع بکات.

٩٥ - إبن شوذب ﴿١٥٦هـ﴾ رحمه الله دەڵێ :نیعمەتی الله یە بەسەر گەنج و أعجمي (غەیری عەرەب) هاوڕێیەکی ئەهلی سوننەی هەبێت یارمەتی بدات بۆ ئەوەی فێری ئەهلی سوننە بێت، چونکە گەنجی ئەعجەمی لەسەرەتادا چی وەرگرت لەسەر ئەوە دەبێت.

٩٦- عمرو بن قيس الملائي ﴿١٤٦ هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : ئەگەر گەنجێکت بینی سەرەتای گەنجایەتی لەگەڵ ئەهلی سوننەدا بوو ئەوا ئومێدت پێی هەبێت، وە ئەگەر بینیت لەگەڵ ئەهلی بیدعەدا بوو ئەوا لێی بێ ئومێدبە، گەنج لەسەر ئەوە دەبێت کە لە سەرەتای گەنجیەتی لەسەری پەروەردە دەبێت .

٩٧ - عمرو بن قيس رحمه الله دەڵێ : گەنج لە پێگەیشتندایە، ئەگەر کاریگەر بێت بەوەی کە لەگەڵ ئەهلی علمدا دابنیشێت، ئەوا سەلامەت دەبێت، وەئەگەر کاریگەر بوو بە غەیری ئەوە ئەوە بەهیلاك دەچێت.

٩٨ - حماد بن زيد ﴿١٧٩ هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : یونس رحمه الله پێی ووتم : ئەگەر من گەنج ببینم لەسەر هەر حاڵەتێکی خراپ، بێ ئومێد نابم لە خێری، هەتا دەیبینم هاوڕێیەتی ئەهلی بیدەع دەکات، کە هاوڕێیەتی کردن دەزانم بەهیلاك چووە .

٩٩ - الحسن البصري رحمه الله دەڵێ : کەسی موبتەدیع هەتا عیبادەتی زیاتربێ، زیاتر لە الله تعالى دوور دەکەوێتەوە .

١٠٠ - ابن عون رحمه الله دەڵێ : تێكۆشەر لە عیبادەتدا لەگەڵ ئەهواء، تێكۆشانەكەی بۆ دەبێتە سزا لە ئاخیرەتدا.

١٠١ - الأوزاعي ﴿١٥٧هـ﴾ رحمه الله دەڵێ :ئیبلیس بە نزیكەكانی خۆی ووت : لەچ لایەكەوە دەچن بۆ نەوەكانی آدم؟
ووتیان : لە هەموو لایەكەوە بۆیان دەچین.
ووتی : ئایا لە شوێنێكەوە بۆیان دەچن كە داوای لێخۆشبوون نەكەن؟
ووتیان : ئەوە شتێكی مەحاڵە، ئەوان جێگیرن لەسەر تەوحید.
ووتی : ئایا شتێكتان پێ نەڵێم كە لەو ڕێگەیەوە بۆیان بچن ئەوان داوای لێخۆشبوون لە الله ناكەن.
ووتی : ئەهواء و بیدعەی لە ناویاندا بڵاوكردەوە.

١٠٢ - سعيد بن عنبسة رحمه الله دەڵێ : ئەگەر پیاو تووشی بیدعەیەك ببێت ئیللا دڵی بەرامبەر موسڵمانان پیس دەبێت، وە ئەمانەتیشی لێ وەردەگیرێتەوە.

١٠٣ - الأوزاعي رحمه الله دەڵێ : هیچ پیاوێك نییە كە تووشی بیدعە بێت، ئیللا وەرعی لێ وەردەگیرێتەوە.

١٠٤ - الحسن رحمه الله دەڵێ : هیچ پیاوێك نییە تووشی بیدعەیەك بێت ئیللا ئیمان تەبەرا لەو كەسە دەكات.

١٠٥ - ابن عون رحمه الله دەڵێ : هەر پیاوێك تووشی بیدعە بێت. ئیللا الله حەیایی لێ وەردەگرێتەوە،

١٠٦ - عثمان بن حاضر ألأزدي رحمه الله دەڵێ : چووم بۆ لای ابن عباس رضي الله عنه، پێم ووت : ئامۆژگاریم بکە، ووتی : بمێنەوە لەسەر ئەوەی لەسەریت، شوێن کەوتووبە، بیدعەچی مەبە.

١٠٧ - إبن مسعود رضي الله عنه دەڵێ : شوێنکەووتەبن و موبتەدیع مەبن ئەوە بەستانە، هەموو داهێنراوێ بیدعەیە، هەموو بیدعەیەکیش گومڕایە.

١٠٨ - طلحة بن مصرف ﴿١١٢هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : هەرچیت بیست باسی مەکە، ئیللا هی ئەو کەسە نەبێت کە لەسەر سوننەتە.

١٠٩ - أبو إدريس الخولاني ﴿٨٠هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : ئەگەر ببینم ئاگرێك داگیرساوە لەناو مزگەوتەکەیدا، پێم خۆشترە لەوەی ببینم کە بیدعەیەکی تێدایە و ناتوانم بیگۆڕم.

١١٠ - عطاء ﴿١١٤هـ﴾ رحمه الله دەڵێ: خەریکە الله عزوجل ئیزنی موبتەدیع نادات تەوبە بکات.

١١١ - ابن عباس رضي الله عنه دەڵێ : هەر کەسێك ئیقرار بەیەکێك لەم ناوە داهێنراوانە بکات، ئەوە پەتی اسلامی لەملی خۆی کردۆتەوە.

١١٢ - ميمون بن مهران رحمه الله دەڵێ : ئاگاداری ئەو ناوانەبن کە بە غەیری إسلام ناونراون.

١١٣ - أنس بن مالك ﴿ ٩٣هـ ﴾ دەڵێ هیچ یەکێك لەم ئەهوائانە لە سەردەمی رسول الله ـدا ﷺ، نەبووە وە لەسەردەمی أبي بكر، وعمر، وعثمان.

١١٤ - مالك بن مغول رحمه الله دەڵێ : هەرکەسێك ناوێك غەیری ئیسلام و سوونەت لەخۆی بنێت، ئەوا دوای هەر دینێكی بخە کە خۆت ئەتەوێ.

١١٥ - عطاء رحمه الله دەڵێ : لەوانەی کە الله تبارك وتعالى بۆ موسى عليه الصلاة والسلام دابەزاندبوو : لەگەڵ ئەهلی ئەهوائ دامەنیشە، شتانێك دەخەنە دڵتەوە کە تێیدای نەبووە .

ووتم : الله تعالى هۆشداری داوە بە پێغەمبەرێکی گەورە کە لەگەڵ ئەهلی بیدەع و ئەهوائ دانەنیشێت، چونکە شتی خراپ دەخەنە دڵیەوە، ئەی چی سەبارەت بە کەسێك لەم سەردەمەدا.

١١٦ - أبو قلابة رحمه الله دەڵێ : هەر قەومێك بیدعەیان تێبکەوێت، ئیللا شمشێر حەڵاڵ دەکەن.

١١٧ - أبو قلابة رحمه الله سەبارەت بەم ئایەتە {إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ} [الأعراف : ١٥٢] دەڵێ : ئەمە پاداشتی هەموو درۆزنێکە تا ڕۆژی قیامەت.

١١٨ - أبو قلابة رحمه الله دەڵێ : ئەهلی ئەهوائ ئەهلی گومڕاین، وە نابینم سەرئەنجامیان ئیللا بەرەوە ئاگر دەڕۆن، تاقیان بکەنەوە هیچ یەکێك لەوان لەسەر ڕەئیك نییە، ئیللا شمشێری لەسەر حەڵاڵ دەکات، وە نیفاق چەند جۆرێکە، دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە : { وَمِنهُم مَّن عَاهَدَ ٱللَّهَ} [التوبة : ٧٥]، { مِنهُم مَّن يَلمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَاتِ} [التوبة : ٥٨]، ﴿وَمِنهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤذُونَ ٱلنَّبِيَّ﴾ [التوبة : ٦١]، قسەکانیان جیاوازە، بەڵام کۆبوونەتەوە لە شك و لە درۆدا .ئەمانە قسەکانیان جیاوازە بەڵام هەموویان کۆبوونەتەوە لە شمشێردا، وە من سەرئەنجامیان نابینم ئیللا لە ئاگردا نەبێت.

١١٩ - ابن عباس رضي الله عنه دەڵێ : هەر کەسێك تەفرەقە بخاتە نێوان جەماعەتەوە بەئەندازەی بستێك، ئەوە پەتی ئیسلامی لە ملی خۆی کردۆتەوە.

١٢٠ - محمد ابن حنفية رحمه الله دەڵێ : ڕۆژی قیامەت هەڵناستێ تاوای لێدێت خەڵکی بەربەرەکانی و مووجادەلە لە پەرستراوەکەیاندا دەکەن.

١٢١ - عبد الله بن عمرو ﴿ ٦٥ هـ ﴾رضي الله عنه دەڵێ : نزیکە ئەو شەیطانانە دەرکەون، کە سلیمان بن داود علیه السلام، دەستگیری کردبوون، خەڵکی تووشی فیتنە دەکەن .

| ووتم : سلیمان علیه السلام کۆمەڵێك شەیطانی دەستگیر کردووە و لە لەدەریادا سجنی کردوون. |
|---|

١٢٢ - أيوب السختياني ﴿١٣١هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : أبو قلابة رحمه الله پێی ووتم : ئەی أيوب، چوارشت لەمنەوە لەبەربەکە:

أ - لە قورئاندا قسە مەکە بەڕەئی خۆت.

ب - وە ئاگاداری قەدەر بە.

ج - وە ئەگەر باسی یەکێك لە هاوەڵانی رسول الله کرا ﷺ دەستی پێووە بگرە.

د - وە گوێت شل مەکە بۆ ئەهلی ئەهواء کە قسەت بۆبکەن، ئەوەی خۆیان بیانەوێت فرێی دەدەنە ناو دڵتەوە.

١٢٣ - إبراهيم نخعي رحمه الله لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا : ﴿وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ﴾ [المائدة : ٦٤] دەڵێ : ئەوانە ئەهلی ئەهوائن.

١٢٤ - معاوية بن قرة رحمه الله دەڵێ : بەربەرەکانی کردن لە دیندا کردەوەکان دەسڕێتەوە.

١٢٥ - يوسف بن أسباط ﴿ ١٩٥ هـ ﴾ رحمه الله دەڵێ : سەیر کردنی کەسی موبتەدیع، نوری حەق لەدڵا دەکوژێنێتەوە .

ووتم : سەلەف هۆشداریان داوە لە سەیرکردنی موبتەدع، چ جای گوێ لێگرتن و دانیشتن لەگەڵیان.

١٢٦ - بشر بن الحارث ﴿ ٢٢٧ هـ ﴾ رحمه الله دەڵێ : ئەگەر ڕێگاکەت لەسەر ڕێگای موبتەدیعێك بوو، ئەوا چاوت بنوقێنە پێش ئەوەی بگەیتە لای ئەو.

١٢٧ - أبو العباس الخطاب رحمه الله دەڵێ : ئەگەر لەماڵەکەت هاتیتە دەرەوە و چاوت بە موبتەدیعێك کەوت بگەڕێرەوە، چونکە شەیطان لەگەڵ هاوەڵانی بیدعەدایە .

ووتم : هەشە دەچێ لەلای موبتەدیع دەرس دەخوێنێ بە کۆمەڵێك بەهانەی سەیر سەیر.

١٢٨ - مسلم بن یسار ﴿ ١٠٠ هـ ﴾رحمه الله دەڵێ : ئاگاداری مووجادەلە بن، ئەوە کاتێکە تێیدا عالم جاهیل دەبێ، وە کاتێکی باشە بۆ شەیطان کە دەستی خۆی تیابوەشێنێ .

ووتم : ئەو شتە لەم سەردەمەدا زۆر باوە کە بانگت دەکەن بۆ مووناقەشە و بۆ موجادەلە، ئاگاداربە ئەی شوێنکەوتەی سەلەف هەرکاتێك بانگیان کردی بۆ مووجادەلە و بۆ مووناقەشە، هەرگیز بەدەم داوا کەیانەوە مەچۆ ڕەتی بکەوە، بڵێ من شوێنکەووتەی دینێکم هیچ گومانێکم لێ نییە .

١٢٩- الحسن رحمه الله دەڵێ : کەسی موبتەدیع هیچی لێوەرناگیرێ، نە ڕۆژو، نە نوێژ، نە حەج، نە عومرە، نە خێر، نە جیهاد، نە فەرزەکان، نەزیادەکان .

ووتم : کۆمەڵانێك هەن لافی جیهاد لێدەدەن، با باش بزانن بەو عەقیدە بیدعیانەی کە هەیانە جیهاد و بێجگەلە لەجیهادیشیان لێوەرناگیرێت.

١٣٠ - الزهري ﴿١٢٤هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : دەست گرتن بە سوننەتەوە ڕزگاربوونە، وە عیلم بەخێرای هەڵدەگیرێتەوە، علم سابتی دین و دوونیایە، وە ڕۆشتنی هەمووی : بە ڕۆشتنی عولەماکانە.

١٣١ - عمر بن عبد العزيز رحمه الله دەڵێ : هەر كەس دینەكەی بكات بە مووناقەشە و بەربەرەكانی كردن، ئەوە زۆرترین ڕاگۆڕینی دەبێ.

١٣٢ - محمد بن علي ﴿١٢٥هـ﴾ رضي الله عنه دەڵێ : لەگەڵ هاوەڵانی مووناقەشە و بەربەرەكانیدا دامەنیشن، چونكە ئەوان مووناقەشە و بەربەرەكانی لە ئایەتەكانی الله عز وجل دا دەكەن.

١٣٣ - غضيف بن الحارث ﴿٦٣ هـ﴾ رضي الله عنه دەڵێ : هیچ بیدعەیەك دەرناكەوێت ئیللا واز لە هاوشێوەكەی دەهێنرێت لە سووننەت .

١٣٤ - إبن سيرين رحمه الله دەڵێ : هەر پیاوێك لەگەڵ ئەثەردا بێت ئەوا لەسەر ڕێگاكەیە (مەبەستی ڕێگا ڕاستەكەیە) .

١٣٥ - إبراهيم النخعي ﴿٩٦ هـ﴾رحمه الله دەڵێ : ئەگەر پێم بگات لە صەحابەوە كە دەستنوێژیان گرتووە لە نینۆكیان زیاتر نەشۆردووە، ئەوا منیش بەس نینۆكم دەشۆم و زیاتر ناشۆم.

ووتم : ئایەت و حەدیثی ڕوون و ئاشكرا هەیە كە شێوازی دەستنوێژ گرتن چۆنە، بەڵام سەلەف مەبەستیان لەم قسانە ئەوەیە، كە هەموو ئایەت و حەدیثێك بە تێگەشتنی صەحابە وەردەگرین ئەوان چیان كردبێ ئێمەش ئاوا دەكەین، الله لێیان ڕازیێ بووە ئێمەش وەك ئەوانە دەكەین بە ئومێدی ئەوەی الله لە ئێمەش ڕازیێ، كەسانێكیشمان هەیە مستەوای بێ ئەدەبیان دەگاتە ڕادەیە دەڵێن صەحابە نەیانپێكاوە، ئەوان نەیانپێكاوە كە لە كاتی دابەزینی ئایەتەكە لەوێ حازربوون، ئەم دوای ١٤٤٣ ساڵ پێكاوویەتی!

١٣٦- شريح ﴿٧٨هـ﴾ رحمه الله دەڵێ :پێویستە شوێن ئەثەر بکەوین، وەهەر شتێکم دەسکەوێ لەپێشینانمانەوە ئەوا پێتان ئەگەیەنم .

١٣٧ - هەنێك لە زانایان دەڵێن : لەدایك بووین لەپێش درووستبوونی فیکرەیی موعتەزیلەوە .

١٣٨ - شعبي رحمه الله دەڵێ : من هەبووم و هیچ ڕافیزەیەك نەبووە لە دوونیادا

١٣٩ - باسی قەدەریەکان کرا لەلای مجاهد رحمه الله
ووتی : کافرم بەدینێك کە لە پێش ئەو دینەوە لەدایك بووم.

١٤٠ - مالك بن أنس رحمه الله دەڵێ : بە پیاوێك ووترا کە لەسەرەمەرگدا بوو : لەسەر چ دینێك دەمری؟
ووتی : لەسەر دینی أبي عمارة، أبي عمارة یەکێك بوو لە ئەهلی ئەهواء.
مالك پێی ووت رحمه الله : واز لەدینی أبي قاسم دێنیت ﷺ، وە دەمریت لەسەر دینی أبي عمارة!

١٤١ - إبن عباس رضي الله عنه دەڵێ : معاوية رضي الله عنه پێی ووتم : تۆ لە میلەتی علي رضي الله عنه؟
ووتم : نا، وە لەمیلەتی عثمان رضي الله عنه نیم، من لە میلەتی رسول الله م ﷺ.

١٤٢ - ابن عباس رضي الله عنه دەڵێ : ئەگەر دوو پیاو کۆببنەوە بۆ ئەوەی بەربەرەکانێ و مووناقەشە بکەن لەسەر دین، جیانابنەوە ئیللا هەتا درۆ بەسەر الله عزوجل وە نەکەن.

١٤٣ - إبراهیم نخعي رحمه الله دەڵێ : هەرگیز بەربەرەکانیم نەکردووە.

١٤٤ - معاذ رحمه الله دەڵێ : دەستی الله لەسەر جەماعەتی موسڵمانانە، هەر کەس خۆی جیابکاتەوە الله منەتی بەو نییە کە خۆی جیاکردۆتەوە.

١٤٥ - مصعب رحمه الله دەڵێ : لەگەڵ ئەو کەسانەدا دامەنیشن کە تووشی فیتنە بوون چونکە ئیللا توشی یەکێك لەم دووانەت دەکەن :
یان تووشی فیتنەت دەکەن شوێنیان دەکەویت، یان لێت جیادەبنەوە و دڵەکەت تووشی ئازار دەکەن.

١٤٦ - علي رضي الله عنه دەڵێ : هەر کەس دووبەرەکی بخاتە ناو جەماعەتەوە، ئەوە پەتی ئیسلامی لەملی کردۆتەوە .

١٤٧ - أبو الزبیر ﴿ ١٢٦ هـ ﴾ رحمه الله دەڵێ : لەگەڵ طاوس رحمه الله چووین بۆلای ابن عباس رضي الله عنه
طاوس پێی ووت : ئەی ابن عباس چی دەڵێی سەبارەت بەوانەی قەدەر ڕەتدەکەنەوە؟
ووتی : هەندێکیانم پیشان بدەن

ووتمان : چيان لێ دەكەيت؟
ووتی : دەست دەبەم بۆ سەری، قورگی دەگرم دەیگوشم هەتا دەیكوژم .

١٤٨ - إبن عباس رضي الله عنه دەڵێ : هەر كەس دووبەرەكی بخاتە نێوان جەماعەتەوە و بمرێ، لەسەر جاهیلیەت مردووە .

١٤٩ - مجاهد ﴿ ١٠٤ هـ ﴾ رحمه الله لە تەفسیری ئەم ئایەتە {يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا} [الأنعام : ٦٨] دەڵێ : درۆ دەكەن بە ئایەتەكانمان.

١٥٠ - الحسن رحمه الله دەڵێ : والله هیچ عەمەلێك لەموبتەدیع قبوڵ ناكات بەوكردەوانە قەت لە الله نزیك نابنەوە ، نە نوێژ، نە ڕۆژ، نە زەكات، نە حەج، نە جیهاد، نە عەمرە، نە خێر، هەتا كۆمەڵێكی لەچاكەكان ژمارد .

١٥١ - لەسەر ئەم قسەیەی الله عزوجل {وَأَفۡئِدَتُهُمۡ هَوَآءٌ} [إبراهيم : ٤٣] ووتی : دەرچوون لە حەق هیچ وەرناگرن.

١٥٢ - أبو حمزة ﴿١٥٠هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : پرسیارم لە إبراهیم رحمه الله كرد سەبارەت بەم ئەهوائانە كە كامیان بەلای تۆوە پەسەندترە؟
حەز دەكەم ڕەئی تۆ وەرگرم.
ووتی : الله تعالى لەم ئەهوائانە مثقالة زەڕیەك خێری دانەناوە، وە ئەم ئەهوائانە هیچ نین ئیللا ڕازاندنەوەی شیطان نەبێت، وە ئەمر هەر ئەو ئەمرەی سەرەتایە (سوننەت).

١٥٣ - أبو العالية ﴿٩٠هـ﴾رحمة الله دەڵێ : الله دوو نیعمەتی پێداوم نازانم کامیان باشترە یان گەورەترە، ئەوەی هیدایەتی داوم بۆ ئیسلام، ئەوی ترشیان پاراستوومی لە الرافضة و الحرورية و المرجئة و القدرية و لەوەی ئەهلی ئەهوائ بم .

١٥٤ - الحسن بن شقيق رحمه الله دەڵێ : ئێمە لەلای ابن مبارك بووین رحمه الله پیاوێك هات بۆلامان

ابن مبارك ووتی : تۆ جەهمی نەبوویت؟

ووتی : بەڵێ.

ابن مبارك ووتی : کە لێرە ڕۆیشتی جارێکی تر نەیەیتەوە بۆلام.

ووتی : من تەوبەم کردووە.

ابن مبارك ووتی : نا، هەتا تەوبەکەت لێ دەردەکەوێت وەك چۆن پێشتر بیدعەکەت لێ دەرکەوتبوو.

١٥٥ - بقية بن وليد ﴿١٩٧ هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : ثابت بن عجلان رحمه الله پێی ووتم : گەیشتووم پێیان أنس بن مالك، وە سعيد بن المسيب، وە عمارا الشعبي، وە إبراهيم النخعي، وە سعيد بن جبير، وە الحكم بن عتيبة، وە حماد بن أبي سليمان، وە عطاء، وە طاووس، وە مجاهد، وابن أبي مليكة، وە مكحول، وە سليمان بن موسى، وە الحسن، وابن سيرين، وە أبا عامر رحمهم اللهگەشت بە ابو بکري صديق رضى الله عنه، هەموویان فەرمانیان بەوە دەکرد نوێژ بکەم بەجەماعەت، ڕێگریان لێ دەکردم لە أهواء و بیدعە، هەتا ووتی : پێی ووتم : ئەی باوکی محمد والله ی هیچ عەمەلێك نییە هێندەی ئەوە لێی دڵنیابم هێندەی ئەوەی دێمە ئەم مزگەوتە، وە ئەگەر والیەکە لەسەر هەر شتێك بێت و هەر کارێکیش ئەنجام بدات، وە ئێمە ئەو کارەی بزانین و لێی ببینین، ئێمە واز لە نوێژ ناهێنین لە دوایەوە.

١٥٦ - إبن وهب ﴿١٢٥هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : پرسیارم لە مالك كرد سەبارەت بە قەدەرییەكان ئایا باشتر وانییە واز لە قسەكردن و بەربەرەكانێ كردن بهێنین لەگەڵیان؟
ووتی : بەڵێ، ئەگەر زانیت ئەو كەسە لەسەر چیە.
ووتی : وە فەرمان دەكەن بە چاكە وە رێگری دەكەن لێیان بە خراپە، وە پێیان دەڵێن ئەو خیلافەی (ناكۆكیەی) لە نێوانمان هەیە، وە خۆت بەگەورە مەزانە ووتنی، وە نوێژ لەدوایانەوە ناكەین.
مالك دەڵی : وای نابینم هاوسەرگیریان لەگەڵ بكرێت.

١٥٧ - پرسیار لە مالك رحمه الله كرا، سەبارەت بە هاوسەرگیری كردن لەگەڵ قەدەریەكان؟
مالك ووتی : {وَلَعَبۡدٌ مُّؤۡمِنٌ خَيۡرٌ مِّن مُّشۡرِكٍ} [البقرة : ٢٢١]

١٥٨ - دەڵێ : گوێم لە مالك بن أنس بوو رحمه الله : ئەو پیاوەی كاتێك كە هەندێك لە ئەهلی أهواء دەهات بۆ لای، دەی ووت : من الله تعالى بەرچاو ڕوونی پێبەخشیووم لەسەر دینەكەی خۆم، بەڵام ئێوە گومانتان لە دینەكەی خۆتان هەیە، بڕۆن بۆ لای یەكێك كە وەك خۆتان گومانی لە دینەكەی هەبێ لەگەڵ ئەودا مووناقەشە و بەربەرەكانێ بكەن .

١٥٩ - مالك رحمه الله دەڵێ : پیاوێك ووتی : من هاتوومەتە ناو ئەو هەموو دینانەوە لە هیچ كامێكیان جێگیربوون و استقامەم نەبینیووە .
پیاوێك لە خەڵكی مەدینە لەوانەی كە قسەكردنی باش بوو ووتی : من پێت دەڵێم بۆچی وایت .

ووتی : لەبەرئەوەی تۆ تەقوای الله ت نیە لە الله ناترسی، ئەگەر هاتوو لە الله بترسایتایە ، الله خۆی ڕێگایەکی نیشان دەدایت.

١٦٠ - و أبو سهيل- مامی مالك بن أنس رحمهم الله دەڵێ : عمر بن عبد العزيز رحمه الله گفتوگۆی لەگەڵ کردم سەبارەت بەقەدەریەکان.
ووتم : وایدەبینم ئیستیتابە بکرێن، یان تەوبە دەکەن یان دەکوژرێن.
عمر ووتی : ئەوە بۆچوونی منیشە .
ومالك بن أنس و الحسن یش رحمهم الله هەمان بۆ چونیان هەبوو .

| ووتم : قەدەریەکان موبتەدیعن هەتا ئەو کاتەی نکۆڵی عیلمی الله دەکەن، واتا دەڵێن الله عیلمی نەبووە بەو کارەی ئێمە دەیکەین، کە نکۆڵیان کرد کافر دەبن، وە ئەو زیادەیەش کەهێناویەتی کە دەڵێت الحسن یش هەمان بۆ چۆنی هەبووە، ڕەددە بۆ ئەو قەدەریانەی کە خۆیان دەدەنە پاڵ الحسن رحمه الله. |
|---|

١٦١ - وە الحسن بن محمد بن علي ﴿٩٩هـ﴾ رحمه الله بە مسوڵمانیان نازانێ [واتە قەدەریەکان]، وەهەروەها خەواریجەکان .

| ووتم : قەدەریەکان کاتێك تەکفیر دەکرێن کە نکۆڵی عیلمی الله بکەن، خەواریجەکانیش کاتێك تەکفیر دەکرێن کە ئەو کەسانە تەکفیر بکەن کە مژدەی بەهەشت و ڕەزامەندی الله یان پێدراوە، وەك هاوەڵانی رسول الله صلى الله عليه وسلم، چونکە حدیث و ئایەت بەدرۆ دەخەنەوە. |
|---|

١٦٢ - إبن مبارك ﴿١٨١هـ﴾ رحمه الله دەڵێت : هەرکەس عیلمی کەلامی وەرگرت توشی زەندیقی دەبێت.

١٦٣ - ابن مبارك رحمه الله دەڵێ : الله مەلائیکەتانێکی هەیە داوای مەجلیسی زیکر دەکەن، بزانە مەجلیست لەگەڵ کێ دەبێت، لەگەڵ هاوەڵانی بیدعەدا نەبێت، الله سەیریان ناکات.

وە لە نیشانەی نیفاق : ئەوەیە لەگەڵ موبتەدیعدا دابنیشیت.

١٦٤ - وە محمد بن النضر الحارثي دەڵێ : هەرکەسێك گوێ بۆ موبتەدیع بگرێت : لە پاراستنی الله دا نامێنت، دەدرێتە دەست نەفسی خۆی.

١٦٥ - الفضيل بن عياض ﴿١٨٧ ھ﴾ رحمه الله دەڵێ : بە باشترینی خەڵکی گەیشتووم، هەموویان هاوەڵانی سوننە بوون، نەهیان دەکرد لە هاوەڵانی بیدەع، هاوەڵی سوننە ئەگەر عەمەل یشی کەم بوو ئومێدم پێی هەیە، وە هاوەڵی بیدەع الله هیچ عەمەل ێکی بەرز ناکاتەوە گەرچی عەمەلەکەی زۆریش بێت .

١٦٦ - عبد الله بن عمر السرخسي رحمه الله دەڵێ : نانم لەلای موبتەدیعێك خوارد، گەیشتەوە بە ابن المبارك رحمه الله ووتی : سی ڕۆژ قسەت لەگەڵ ناکەم.

١٦٧ - إسماعيل الطوسي رحمه الله دەڵێ : ابن المبارك رحمه الله پێی ووتم : ئەگونجێت مەجلیست لەگەڵ مسکینەکان (هەژارەکان) بێت، ئاگاداربە مەجلیست لەگەڵ هاوەڵانی بیدەع نەبێت، دەترسم لە ڕق و قینی الله دابەزێتە سەرت .

١٦٨ - الفضيل بن عياض ﴿١٨٧ ھ﴾ رحمه الله دەڵێ : ئاگاداربە لە دانیشتنت لەگەڵ هاوەڵانی موبتەدیعەکان ، من دەترسم ڕق و قینی الله دابەزێتە سەرت .

١٦٩ - وه منصور بن المعتمر ﴿١٣٢هـ﴾ رحمه الله دهڵێ : الله عزوجل آدم عليه السلام ی نارد به شەریعەتێك، خەڵكی لەسەر شەریعەتی آدم عليه السلام دەڕۆیشتن هەتا زەندەقە دەركەوت، دواتر شەریعەتی آدم عليه السلام ڕۆیشت، دواتر الله عزوجل نوح عليه الصلاة والسلام ی نارد به شەریعەتێك، خەڵكی لەسەر شەریعەتی نوح عليه الصلاة والسلام دەڕۆیشتن هەتا زەندەقە دەركەوت، دواتر شەریعەتی نوح عليه الصلاة والسلام ڕۆیشت، دواتر الله عزوجل إبراهيم عليه الصلاة والسلام ی نارد به شەریعەتێك، خەڵكی لەسەر شەریعەتی إبراهيم عليه الصلاة والسلام دەڕۆیشتن هەتا زەندەقە دەركەوت، دواتر شەریعەتی إبراهيم عليه الصلاة والسلام ڕۆیشت، دواتر الله عزوجل موسى عليه الصلاة والسلام ی نارد به شەریعەتێك، خەڵكی لەسەر شەریعەتی موسى عليه الصلاة والسلام دەڕۆیشتن هەتا زەندەقە دەركەوت، دواتر شەریعەتی موسى عليه الصلاة والسلام ڕۆیشت، دواتر الله عزوجل عيسى عليه الصلاة والسلام ی نارد به شەریعەتێك، خەڵكی لەسەر شەریعەتی عيسى عليه الصلاة والسلام دەڕۆیشتن هەتا زەندەقە دەركەوت، دواتر شەریعەتی عيسى عليه الصلاة والسلام ڕۆیشت، دواتر الله عزوجل محمد عليه الصلاة والسلام ی نارد به شەریعەتێك، ناترسم ئەم شەریعەتەش بڕوات ئیللا بەزەندەقە نەبێت.

١٧٠ - محمد بن علي﴿ ٨٠ هـ﴾ رحمه الله دهڵێ : گوێڕایەڵی سەركردەكانی دونیا مەكەن دین لە دڵەكانتان ادا دەسڕێنێتەوە.

١٧١ - الشعبي رحمه الله دهڵێ : ئەگەر خەڵكی گوێڕایەڵی سوڵتانی كرد لەو بیدعانەی دایدەهێنێت، الله ئیمان لەدڵیاندا دەباتە دەرەوە، ترس دەخاتە ناو دڵیانەوە .

١٧٢ - الحسن البصري رحمه الله دەڵێ : کۆمەڵە سەرکردەیەك دێن خەڵکی بانگ دەکەن بۆ موخالەفە کردنی سوننەت، خەڵکەکەش گوێڕایەڵیان دەکەن لە ترسی ڕۆشتنی دونیاکەیان، دوای ئەوە الله ئیمانیان لێ دەسێنێتەوە، وە فەقیریان دەکات، وە صەبریان لەناو ناهێڵێت، هیچ پاداشتێکیشیان ناداتەوە لەسەری.

١٧٣ - یونس بن عبید ﴿١٤٠هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : ئەگەر سوڵتان موخالەفەی سوننەی کرد، وە ژێر دەستەکانی ووتیان : ئەمرمان پێکراوە کە گوێڕایەڵی بکەین، ئەوە الله تعالی شك دەخاتە ناو دڵەکانیانەوە، وە قسە ووتن بەیەکیان پێ دەبەخشێت.

١٧٤ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : (هاوڕێ لەسەر دینی هاوڕێیەکەیەتی، هەر یەکێکێکتان سەیر بکات بزانێت هاوڕێیەتی کێ دەکات).

١٧٥ - سلیمان بن داود علیه السلام دەفەرمووێت : حوکم لەسەر هیچ کەسێك مەدەن هەتا دەبینن برادەرایەتی کێ دەکات .

ووتم : واتە برادەرەکەی چۆن بوو ئەویش ئاوایە، برادەرەکەی ئەهلی سوننە بوو سوننیە، برادەرەکەی ئەهلی بیدەع بوو موبتەدیعە.

١٧٦ - الله عزوجل وەحی بۆ موسی کرد علیه الصلاة والسلام پێی فەرموو : ئەی موسی ئاگاداربە، هاوڕێیەکان بۆ خۆت هەڵبژێرە، هەر هاوڕێیەکت کە لەسەر خراپە بێت لێی ئاگاداربە، ئەو کەسەی کە لەسەر خراپەیە ئەوە دووژمنی تۆیە، وە من لێی بەریم.

١٧٧ - إبن المبارك ﴿١٨١ هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : هەر کەسێك بتوانێت بیدعەکەیمان لێ بشارێتەوە، ناتوانێت خۆشەویستەکەیمان لێ بشارێتەوە .

ووتم : واتە ئەگەر موبتەدیعێکی خۆشویست ئەوا ئەویش وەك ئەو وایە بەس بیدعەکەی شاردۆتەوە، جا دیقەت بدەن چەند کەس هەیە لافی سوننی بوون لێدەدەن، لەکاتێکدا ئەهلی بیدەع بە مامۆستا و خۆشەویست دەزانن.

١٧٨ - وە دەڵێن : مەجوسیەکان دین و کتێبیان هەبوو، یەکێك لە پاشاکانیان چووە لای خوشکێکی، لە گەڵەکەی ترسا، بۆیە ووتی : ئەوەی من ئەنجامم داوە حەلالە، دواتر لەسەر ئەوە خەڵکی دەکوشت، دواتر ئەو شتەیان لێ ئاشکرا بوو تا وای لێهات نیکاحی خوشك و دایك دەکرا لەناو مەجوسیەکاندا، وە شەریعەتی سەرەتایان پوچەڵ بوویەوە .

١٧٩ - وە الحسن البصري رحمه الله دەڵێ : دین بە پتەوی و جێگیری دەمێنێتەوە هەتا ئەو کاتەی ئەهواء دەکەوێتە ناو سوڵتانەکانەوە، چونکە ئەوان دینداریەتی بە خەڵك دەکەن، ئەگەر ئەوان تێکەوتن ئەی کێ دینداریەتیان پێ بکات؟. !

١٨٠ - إبن مسعود رضي الله عنه دەڵێ : ئەگەر خەڵکی کەوتنە خراپەوە، بڵێ : من هیچ پێشەوایەکم نییە لەخراپەدا، نەفسی خۆت ڕابێنە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر هەموو خەڵکی کافر بوون من کافر نابم.

١٨١ - عمر بن الخطاب رضي الله عنه بە سوید بن غفلة ی فەرموو : لەدوای من خیلاف دەبینی، گوێڕایەڵی ئیمام بکە، ئەگەر عەبدێکی گوێ قرتاو یان لوت قرتاویش بوو، ئەگەر زوڵمی لێکردی سەبر بگرە، گەر لێی زەوت کردی سەبر

بگره، ئەگەر ویستی فەرمانت پێبکات بە شتێك كە لە دینەكەت كەم بكاتەوە، پێی بڵێ : خوێنم لەپێش دینەكەمەوەیە.

١٨٢ - وە مطرف بن عبد الله ﴿٩٥هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : : هەر كەسێك دینەكەی بكاتە قوربانی بۆ ماڵ و سامانەكەی، ئەوا الله تعالى فەقیری پێدەبەخشێت، وە رۆژی قیامەت لە كۆمەڵە و تاقمی إبلیس حەشریان دەكات و پێش إبلیس یان دەدات بۆ جەهەنەم .

١٨٣ - الفضيل بن عياض ﴿١٨٧ هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : بەهێزترین پەتی ئیسلام، خۆشویستنە لەپێناو الله، وە رِق لێبوونەیە لە پێناو الله.

١٨٤ - الفضيل بن عياض رحمه الله دەربارەی كەسی موبتەدیع دەڵێ : لێی دڵنیا مەبە لەدینەكەت، وە ڕاوێژی پێمەكە لە شتەكانتدا، وە لەگەڵی دامەنیشە، هەر كەس دابنیشێت لەگەڵ موبتەدیع الله كوێری پێدەبەخشێ (واتا دڵی كوێر دەكات لەئاست وەرگرتنی حەق ـدا).

١٨٥ - الفضيل بن عياض رحمه الله دەڵێ : سەیركردنی ئیماندار بۆ ئیماندار ڕوناكی دەبەخشێ بەدڵ، وە سەیركردنی موبتەدیع كوێری دەهێنێ، واتە : بۆ دڵ.

١٨٦ - وە الفضيل بن عياض (١٨٧ هـ) رحمه الله دەڵێ : ژیانێكی ئاسودە و خۆش بگرە بەر : ئیسلام و سوننەت.

١٨٧ - وه مجاهد رحمه الله له تهفسيرى ئهم ئايهتهى الله عزوجل دهڵێ : {فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةًۖ} [النحل : ٩٧] . مجاهد دهڵێ : ڕهئى باش . واته : سوننهت.

١٨٨ - وه الفضيل بن عياض رحمه الله دهڵێ : كهسى موبتهديع بۆنى بهههشت ناكات .

١٨٩ - وه الفضيل بن عياض رحمه الله دهڵێ : خۆشى بۆ ئهو كهسهى لهسهر ئيسلام و سوننهت بمرێ . دواتر الفضيل گريا بۆ سهردهمێك كه بيدعهى تێدا دهردهكهوێ، ئهوه بهو جۆره و بهو جۆره دهبێت، وه قسهى زۆرترى كرد.

١٩٠ - الفضيل بن عياض رحمه الله دهڵێ : ههركهسێك لهگهڵ موبتهديعدا دابنيشێت، حيكمهتى پێنادرێت .

١٩١ - الفضيل بن عياض رحمه الله دهڵێ : لهگهڵ موبتهديع دامهنيشه، ئهترسم لهوهى لهعنهتت لێبكرێ.

١٩٢ - وه الفضيل بن عياض رحمه الله دهڵێ : ههر كهسێك نهرم و نيان بێت لهگهڵ موبتهديع دا، ئهوا يارمهتى داوه له ڕووخاندنى ئيسلام دا.

١٩٣ - وه الفضيل بن عياض رحمه الله دهڵێ : الله تعالى بهندانێكى ههيه شارهكانى پێ زيندوو دهكاتهوه، ئهوانيش هاوهڵانى سوننهن، ههر كهسێك لهوان

بێت و ئاقڵ بێت ناچێته ناو بۆشایی لوتیەوە، وە هەر کەسێك وابوو ئەوا لە حیزبی الله عزوجل ە.

١٩٤ - وە الفضیل بن عیاض رحمه الله دەڵێ : هەر کەسێك دوای جەنازەی موبتەدیعێك بکەوێت، لە تورەی الله دا دەبێت هەتا دەگەڕێتەوە .

١٩٥ - وە سفیان بن عیینة ﴿١٩٨هـ﴾ رحمه الله دەڵێ :بە پیاوێکی ووت لە کوێوە هاتووی؟ ووتی : لە لای جەنازەی فڵانی کوڕی فڵان.
ووتی : هیچ حدیث ێکت پێناڵێم، استغفرالله تعالی، وە سەردانیشم مەکە، من ئەو پیاوەم بینیوە کە ڕقی لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ، تۆش دوای جەنازەکەی دەکەوی. !

١٩٦ - وە هارون بن زیاد رحمه الله دەڵێ : گوێم لە الفریابي بوو رحمه الله کە پیاوێك پرسیاری لێکرد سەبارەت بە کەسێك کە جنێو بە أبي بکر بدات؟
ووتی : کافره.
ووتی : نوێژی لەسەر بکەین؟
ووتی : نەخێر.
پرسیارم لێکرد ووتم : چی لێبکەین لەکاتێکدا ئەو دەڵێ، لا إله إلا الله؟
ووتی : دەستی لێ مەدەن، بەدارێك پاڵی پێوە بنێن تا دەکەوێتە ناو ئەو چاڵەی بۆتان هەڵکەندووە.

١٩٧ - وە محمد بن بشار ﴿٢٥٢هـ﴾ رحمه الله دەڵێ :: بە عبد الرحمن بن مهدي م ووت : ئایا ئامادەی جەنازەی کەسێك بم کە جنێو بە هاوەڵانی رسول الله ﷺ دەدات؟ ووتی : ئەگەر لە کەس و کاری من بوایە میراتیم لێ نەدەگرت.

١٩٨ - وه أبي بكر بن عياش ﴿١٩٣ هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : نوێژ ناكەم لەسەر الرافضة و الحرورية (الحرورية فيرقەيەكن لە خەواريـج)، لەبەر ئەوەی الرافضة عمر بەكافر دەزانن، الحرورية ش علي بەكافر دەزانن.

١٩٩ - وه طلحة بن مصرف ﴿١١٢ هـ﴾رحمه الله دەڵێ : الرافضة ژنيان لێ مارە ناكرێ، سەربڕاوی دەستيشيان ناخورێ، لەبەر ئەوەی مورتەدن .

٢٠٠ - وه بە الحسن بن البصري رحمه الله ووترا : فڵان كەس جەنازەيەكی شۆردووە كە ئەهلی ئەهواء بووە.
ووتی : بيناسنەوە كە مرد ئێمەش نوێژی لەسەر ناكەين.

٢٠١ - وه إبن سيرين رحمه الله پياوێكی بينی لە هاوەڵەكانی خۆی لە هەندێك شوێنی البصرة
پێی ووت : ئەی فڵان كەس چی دەكەيت لێرە؟
ووتی : سەردانی پياوێكم كرد عيلەيەكی هەيە يانی ئەهلی ئەهوائ ە.
إبن سيرين پێی ووت : ئەگەر نەخۆش كەوتی سەردانت ناكەين، ئەگەر مرديشی نوێژت لەسەر ناكەين، ئيللا مەگەر تەوبە بكەيت
ووتی : تەوبەم كرد تەوبەم كرد .

٢٠٢ - وه الفضيل بن عياض  رحمه الله دەڵێ : خواردنی يەهودی و نەصڕانی دەخۆم، بەڵام خواردنی موبتەديع ناخۆم.

٢٠٣ - وه رحمه الله دهڵێ : يا الله وا نه‌كه‌يت ئه‌هلى بيده‌ع هيچ چاكه‌يه‌كى هه‌بێت به‌سه‌ر منه‌وه، دواتر دڵه‌كه‌م خۆشى بووێت.

٢٠٤ - وه الفضيل بن عياض رحمه الله دهڵێ : الله كه زانى پياوێك هه‌يه ڕقى له موبته‌ديعه، ئومێده‌به‌م الله لێى خۆشبێت، ئه‌گه‌رچى كرده‌وه‌شى كه‌م بێت .

ووتم : له الله تعالى نزيك ببنه‌وه، به ڕقلێبونه‌وه له موبته‌ديعه‌كان.

٢٠٥ - وه المروذي ﴿٢٧٥ هـ﴾ رحمه الله دهڵێ : پرسيارم له أبو عبد الله (أحمد بن حنبل) كرد رحمه الله سه‌باره‌ت به كه‌سێك كه جنێو به أبي بكر و عمر و عثمان و عائشة بدات رضي الله عنهم؟
ووتى : واى نابينم له‌سه‌ر ئيسلام بێت .

٢٠٦ - وه مالك بن أنس رحمه الله دهڵێ : ئه‌و كه‌سه‌ى جنێو به هاوه‌ڵانى رسول الله ﷺ ده‌دات، هيچ سه‌همێكى نييه له ئيسلامدا، يان ووتى : هيچ به‌شێكى نييه له ئيسلامدا.

٢٠٧ - وه بشر بن الحارث ﴿٢٢٦ هـ﴾ رحمه الله دهڵێ : هه‌ر كه‌سێك جنێو به هاوه‌ڵانى رسول الله ﷺ بدات، ئه‌وا كافره، ئه‌گه‌ر به‌ڕۆژووش بێت، وه نوێژيش بكات، وه واش بزانێ كه مسوڵمانه .

٢٠٨ - وه الأوزاعي رحمه الله دهڵێ : هه‌ر كه‌سێك جنێو به أبو بكر الصديق بدات رضي الله عنه، ئه‌وا له دينه‌كه‌ى هه‌ڵگه‌ڕاوه‌ته‌وه، وه خوێنى حه‌لال كردووه .

٢٠٩ - أبو عبيد القاسم بن سلام ﴿٢٢٤هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : الرافضة هيچ بەشێكی نییە لە فەیئدا، وە لە غەنیمەتدا، لەبەر ئەم قسەیەی الله عزوجل : {وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا}، [الحشر : ١٠].

٢١٠ - وە حماد بن زيد ﴿١٧٩﴾ رحمه الله دەڵێ : من لەگەڵ أيوب و يونس و إبن عون بووم رحمهم الله، عمرو بن عبيد هات بەلاماندا، سەلامی كرد و وەستا كەسیان جوابیان نەدایەوە، دواتر ڕۆیشت
كەسیان باسیان نەكرد .

| ووتم : عمرو بن عبيد كەسێكی موبتەدیعی كافر بووە. |
|---|

٢١١ - وە الفضيل بن عياض رحمه الله دەڵێ : دەستی الله لەسەر جەماعەتە، الله سەیری موبتەدیع ناكات.

| ووتم : الله تعالى سەیری هەر كەسێك نەكات ڕەحمی پێناكات. |
|---|

٢١٢ - وە الزائدة ﴿١٦٠ هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : بە منصور م رحمه الله ووت : ئەی أبا عتاب، ئەگەر یەكێك لە ئێمە بەڕۆژوو بێ قسە بەوانە بڵێ كە قسە بە أبي بكر و عمر رضي الله عنهما دەڵێن؟
ووتی : بەڵێ.

| ووتم : مەبەستی ئەوەیە ڕۆژووەكە ناشكێ یان ڕۆژووەكە خراپ ناكات. |
|---|

٢١٣ - وە الحسن البصري رحمه الله دەڵێ : موبتەدیع غەیبەتی نییە .

ووتم : واتە ئەگەر لەپاشە ملە باسی موبتەدیعێکت کرد، غەیبەت نییە و هیچ تاوانبار نابی.

٢١٤ - وە العطاء رحمە الله دەڵێ : الله تعالی ئیزنی موبتەدیع نادات تەوبە بكات

ووتم : كەسی موبتەدیع وەك كەسی تاوانبار نییە، تاوانبار كە تاوانێك دەكات بۆ نموونە : زینا دەكات، دەزانێ حەرامە دوای زیناكە پەشیمان دەبێتەوە و تەوبە دەكات، بەڵام كەسی موبتەدیع ئەوەی دەیكات بە هەڵەی نازانێ بگرە بەدینی دەزانێ، ئێ كەسیش تەوبە لەدینداریتی ناكات.

٢١٥ - وە أبو عبید دەڵێ : هەڵسووكەوتم لەگەڵ زۆر خەڵكدا كرد، وە قسەم لەگەڵ ئەهلی كەلامدا كرد، هیچ قەومێكم نەبینی، لاوازتر بێت لە بەڵگە، وە گەمژەتر بێت لە رافضة.

٢١٦ - وە باسی ئەهلی ئەهوائ م كرد لای رقبة بن مصقلة ووتی : رافیضەكان بوختان دەكەن بە دەلیل.
وە مورجیئەكان لەسەر دینی پاشاكانن.
وە زەیدییەكان وای دەبینم كە ئافرەتێك ئەم بیر و بۆچوونەی بۆ دانابن.
وە موعتەزیلەكان : والله دەرنەچووم بۆ كێڵگەكەم وویستوومە بگەڕێمەوە ئیللا وە ئەوان گەڕاونەتەوە لە بیروڕای خۆیان.

٢١٧ - وە طلحة بن مصرف رحمه الله دەڵێ : ئەگەر ئێستا من دەستنوێژم نەبوایە ئەوا بۆم باس دەكردن كە رافضة كان چی دەڵێن.

٢١٨ - وە مغيرة رحمە الله دەڵێ : جرير بن عبد الله و وعدي بن حاتم، چوونە دەرەوە ڕۆیشتن بەرەو قرقیسیاء، ووتیان : ئێمە لە شارێكدا نامێنینەوە (قرقیسیاء)، كە جنێو بە هاوەڵانی رسول الله ﷺ بدرێت عثمان بن عفان رضي الله عنە.

٢١٩ - وە أحمد بن عبد الله بن يونس ﴿٢٢٧ھ﴾ رحمە الله دەڵێ : محمد بن عبد العزيز التيمي رحمە الله ماڵەكەی خۆی فرۆشت، وە ووتی : من لە كوفە دانانیشم، من لەو شارە دانانیشم كە جنێو بە هاوەڵانی رسول الله ﷺ دەدرێت.

٢٢٠ - وە العوام بن حوشب ﴿١٤٨ھ﴾ رحمە الله دەڵێ : بە پێشینانی ئەم ئوممەتە گەیشتووم كە هەندێكیان بە هەندێكیان دەووت : باسی چاكەی هاوەڵانی رسول الله ﷺ بكەن بۆ ئەوەی دڵەكان بەیەكەوە تەبابن، وە باسی شەڕەكانی نێوانیان مەكەن، بۆئەوەی فیتنە نەكەوێتە ناو خەڵكی.

٢٢١ - وە سفيان بن عيينة رحمە الله دەڵێ : هیچ كەسێك نییە ڕق لە دڵی دابێت بەرامبەر هاوەڵانی رسول الله ﷺ، ئیللا بەرامبەر موسڵمانانیش ڕق لە دڵیایەتی.

٢٢٢ - وە سفيان رحمە الله دەڵێ : {تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ}، [البقرة : ١٣٤].
ووتی : هاوەڵانی رسول الله ﷺ.

٢٢٣ - وە الشعبي رحمه الله دەڵێ : مناضرەم لەگەڵ ئەهلی ئەهواء كرد، وە قسەم لەگەڵ ئەهلی ئەهواء كرد، نەمبینی هیچ كەسێك لەوان بێ ئەقڵ تر بێت له الخشبية .

٢٢٤ - عاصم بن ضمرة ﴿٧٤هـ﴾ رحمه الله دەڵێ: بە حسن بن علي رضي الله عنه م ووت : شیعەكان دەڵێن : وایدەبینن كە علي زیندوو دەبێتەوە؟
ووتی : درۆیان كرد، ئەگەر ئێمە ئەوەمان بزانیبوایە خێزانەكانی هاوسەرگیریان نەدەكردەوە، وە ئێمە سەروەتەكەیمان بەش نەدەكرد.

٢٢٥ - وە سفيان الثوري رحمه الله دەڵێ : هەر كەسێك علي پێش بخات بەسەر أبي بكر و عمر دا، ئەوا أبي بكر و عمر ی عەیبدار كردووە، وە ئەوانەشی عەیبدار كردووە كە أبي بكر و عمر پێش دەخەن بەسەر علي دا.

٢٢٦ - وە جابر بن يزيد الجعفي ﴿١٢٨هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : محمد بن علي پێی ووتم : ئەی جابر، پێم گەیشتووە قەومێك لە العراق، قسە بە أبي بكر و عمر دەڵێن، وا گومان دەبەن ئەوان ئێمەیان خۆش دەوێت، وا گومان دەبەن كە ئێمە فەرمانمان بەوە كردووە قسەیان پێ بووترێت، لەمنەوە بیگەیەنە بەوان كە من لەوان بەریم، وە سوێند بەو زاتەی كە نەفسی منی بە دەستە وای دەبینم بە ڕشتنی خوێنی ئەوان لە الله عزوجل نزيك بینەوە، ئەوانە دوژمنی الله تعالیٰ و لێی بێ ئاگاین.

٢٢٧ - وە جابر رحمه الله دەڵێ : كەسێك هات بۆ لای علي بن الحسن رحمه الله وەسف و ستایشی كرد.
ووتی : هەیە لە ئێوە درۆزنتر و تاوانبارتر لەلای الله عزوجل، ئێمە لە باشەكانی

قەومەکەمانین، پێویست ناکا موناقەشە بکرێ لەوەی کە ئێمە لە باشەکانی قەومەکەمانین.

٢٢٨ - وە سليمان بن قرم الضبي رحمه الله دەڵێ : من لەلای عبد الله بن الحسين بن الحسن بووم، پیاوێك پێی ووت : ئایا کەسێك هەیە لەئەهلی قیبلە کە شایەتی بدەین کە موشریکە؟
ووتی : بەڵێ، الرافضة، شایەتی دەدەم کە ئەوان لەموشریکەکانن، وە چۆن لەموشریکەکان نین، ئەگەر لێیان بپرسرێ ئایا رسول الله ﷺ تاوانی ئەنجام داوە؟
دەڵێن : بەڵێ، لەکاتێك ـدا الله لە گوناحی ڕابردوو و داهاتووی خۆشبووە.
وە ئەگەر پێیان بڵێی : علي تاوانی ئەنجام داوە؟
دەڵێن : نەخێر.
جا هەر کەسێك وا بڵێ : کافر دەبێت.

٢٢٩ - وە أبو القاسم عبد الله بن محمد بن إسحاق بۆی گێڕاینەوە، ووتی : عباس الدوري بۆی گێڕاینەوە، ووتی : جعفر بن عون بۆی گێڕاینەوە، لە فضيل بن مرزوق، ووتی : گوێم لە عبد الله بن حسن بن حسن بە پیاوێکی الرافضة ی ووت : والله ی کوشتنی تۆ لە الله م نزیك دەکاتەوە ئەگەر ئەو عەهد و ئەمانەتە نەبوایە کە لەنێوانمان دایە.

٢٣٠ - وە جابر بن رفاعة دەڵێ : پرسیارم لە جعفر بن محمد رضي الله عنه کرد سەبارەت بە أبي بكر و عمر رضي الله عنهما؟
ووتی : الله نەمخاتە بەر شەفاعەتی محمد ﷺ ئەگەر لە الله نزیك نەبمەوە بە خۆشویستنیان، وە بە سەڵاوات دان لەسەریان.

٢٣١ - وه لحسن صالح ﴿٢٠٤هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : پرسیارم له جعفر بن محمد رحمه الله كرد سەبارەت به أبي بكر و عمر رضي الله عنهما؟
ووتی : بەریم له هەموو ئەو كەسانەی كه به چاكه باسیان ناكەن.
ووتم : تۆ ئەمه له ترسان دەڵێی؟
ووتی : ئەگەر وانەبوو ئەوا من له موشریكەكانم وه شەفاعەتی محمد ﷺ نامگرێتەوه ئەگەر به خۆشویستنیان له الله عزوجل نزيك نەبوومەوه، بەڵام قەومێك هەن كه قسەیان پێ دەڵێن.

٢٣٢ - وه أبو خالد الأحمر ﴿١٨٩هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : پرسیارم له عبد الله بن حسن بن حسن رضي الله عنهما كرد سەبارەت به أبي بكر و عمر رضي الله عنهما
ووتی : سەڵاواتی الله یان لەسەر بێت، وه سەڵاوات لەسەر ئەو كەسانه نەبێت كه سەڵاوات یان لەسەر لێنادەن، وه ئێمه بەیانی لەوانه بەرین كه قسەیان پێ دەڵێن.

٢٣٣ - وه محمد بن علي بن الحسين ﴿١١٨﴾ رحمه الله دەڵێ :هەر كەسێك ئێمه پێشبخات بەسەر أبي بكر و عمر رضي الله عنهما ئەوه بەریه لەسوننەتی باپیرمان ﷺ وه ئێمه دوژمنیانین لەلای الله عزوجل.

٢٣٤ - وه علي بن أبي طالب رضي الله عنه دەڵێ : رسول الله ﷺ فەرمووی : قەومێك دێن كه به الرافضة ناسراون، له هەر شوێنێك گرتتن بیانكوژن، چونكه ئەوانه له موشریكەكان .
ووتم : یا رسول الله ﷺ نیشانەی ئەوان چییه بەچی بیانناسینەوه؟

فەرمووی ﷺ : شتانێك دەدەن بە دەمی تۆوە كە تۆ لەسەری نیت، وە قسە بە سەلەف دەڵێن .

٢٣٥ - وە علي رضي الله عنه دەڵێ : ئەم ئوممەتە دابەش دەبێت بەسەر حەفتا و ئەوەندە فیرقەدا، خراپترینی ئەم فیرقانە ئەوانەن كە بانگەشەی خۆشویستنی ئێمە دەكەن، وە موخالەفەی ئەمری ئێمە دەكەن.

٢٣٦ - وە علي رضي الله عنه دەڵێ : دوو كەس بەرەو لەناوچوون دەچن : كەسێك كە زیادەڕەوی بكات لە خۆشویستندا، وە كەسێك زیادەڕەوی بكات لە رِق لێبوونەوەدا.

٢٣٧ : - أبو بكر بن عبد الله بن محمد بن زياد النيسابوري بۆی گێڕامەوە، ووتی : عبد الملك بن عبد الحميد الميموني بۆی گێڕامەوە، ووتی : أحمد بن حنبل رحمه الله پێی ووتم : ئەی أبا الحسن، هەر كاتێك كەسێكت بینی كە یەكێك لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ بە خراپە باس دەكات، ئەوا تۆمەتباری بكە لەسەر ئیسلام.

٢٣٨ - وە علي بن أبي طالب رضي الله عنه دەڵێ : رسول الله ﷺ فەرمووی : قەومێك دەردەچن پێش هاتنی قیامەت پێیان دەوترێت : الرافضة، بەرین لە ئیسلام.

٢٣٩ : - القاضي بن مطرف بۆی گێرامەوە، ووتی : محمد بن أحمد بن محمد بۆی گێڕامەوە، ووتی : محمد بن أحمد بن خالد بۆی گێڕامەوە، ووتی : أبو عبد

الله المؤدب المعروف بابن شخايل بۆی گێڕامەوە، ووتی : يزيد بن محمد الثقفي بۆی گێڕامەوە، ووتی : حنان بن سدير بۆی گێڕامەوە، ووتی : لە سدير، لە محمد بن علي، لە آبائەە، ووتی:

علي بە نوف البكالي ووت : ئەی نوف ئايا دەزانی دۆست و خۆشەويستان لايەنگرانی من كێن؟

ئەويش ووتی ناوالله نازانم:

علي يش پێی ووت: دۆست وخۆشەويستان و ئەوانەی كە منيان خۆشدەوێ بريتين لەو كەسانەی كە : لێويان وشكە، سكيان خاڵييە، خواپەرەستی وعيبادەت لەرووخسارياندا ديارە، بەشەوا خەريكی عيبادەتن وە بە رۆژيشدا وەك شێرن، كاتێك كە شەو دێت بەسەرياندا ئەوان لە جێگاكانيان هەلدەستن خەريكی عيبادەت و هاوارن وەك چۆن كاتێك ملی گايەك لەگەردنی جيا دەبێتەوە هاوار دەكات بەو چەشنە خەريكی هاوار وپارانەوەن لە الله، ئەی نوف شيعە و دۆست و لايەنگرانی من ئەوانەن كە : ئەگەر بيان بينی ناناسرێن، وە ئەگەر داوای هاوسەر بكەن هاوسەرگيريان لەگەل ناكرێت، وە ئەگەر نەخۆش بن سەردانيان ناكرێ، وە ئەگەر ناديار بن ون نابن، لايەنگران و دۆستانی من ئەوانە كە : لەپێناو الله دا ماڵ وسامانی خۆيان دەبەخشن درهەمێكيان هەبێت دەيبەخشن فلسێكيان هەبێت دەيبەخشن جلێكيان هەبێت دەيبەخشن ئەگەريش نەيان بێت هيچ دۆست ولايەنگرانی من ئەوانەن كە : لەقسە كردنيان وەك سەگ هاوار ناكەن وە تەماعيان نيە وەكو تەماعی باڵندەيەك زۆر بەتەماع نين، وە داوای هيچ لە هيچ كەسێك ناكەن ئەگەر لەبرسا بمرن، ئەگەر ئيماندارێك ببينن رێزی لێ دەگرن، ئەگەر فاسقێك ببينن هەجری دەكەن، ئا ئەوانە ولاهی ئەی نوف دۆست و خۆشەويست و شوێنكەوتوان و لايەنگرانی منن، خراپەكانيان خەڵك لێيان ئەمينە، دڵيان حەزين وغەمبارە پێويستەكانيان كەمە، نەفسيان پاكە ئەگەر ولات و شاريان جياواز بێت دڵەكانيان جياواز نييە

كاتێك كە شەو دێت ئەوان ناوچاوانيان لە سوجدە دايە خەريكی عيبادەتن و فرمێسكەكان بەسەر رووخسارياندا دەروات وهاوار وناڵەيان بۆ رزگار كردنی گەردنيان لە جەهەنەم،

کاتێکیش کە ڕۆژ دێت کەسانی زانا و نەرم ونیان بەڕێز و گەورە و چاك و پاکن لەگەل خەلکی دا، وە لە عیبادەتیاندا بە ڕۆژدا لەمامەلەکردنیاندا، ئەی نوف ولاهی ئەوانە دۆست ولایەنگرانی منن کە : زەویان کردووە بەراخەرێك و ئاویشیان کردووە بە بۆنێك بۆخۆیان قورئانیان کردووە بە شیعار و گوفتاریان وە دوعایان کردووە بە ویردی سەر زمانیان هەمیشە دەپارێننەوە وە لە دوونیا دەژین و جێی دەهێلن بەو شێوەی کە عیسی بن مەریم علیه الصلاة السلام ژیا و لەسەر ئەو ڕێبازە دەڕۆن .

٢٤٠ - ئەوەی الله عزوجل فەرزی کردووە لەسەر بەندەکانی، وە رسول الله ﷺ ی بەوە ناردووە، وە کتێبی لەسەر ئەوە دابەزاندووە، وە ئەویش ئەوەیە کە ئیمان ت بە الله عزوجل هەبێ.
ئەوە واتای ئەوەیە : کە باوەڕت بەوە هەبێ کە فەرموویەتی، وە ئەوەی ئەمری پێکردووە، وە ئەوەی فەرزی کردووە، وە ئەوەی نەهی لێکردووە، لە هەموو ئەوانە کە رسول ی لەسەر ناردووە، وە کتێبی لەسەر دابەزاندووە .
وە بەمە نێردراوەکانی لای خۆی ناردووە، وە فەرموویەتی عزوجل : {وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ} [الأنبياء : ٢٥].

٢٤١ - وە بەڕاست دانانی ئەمە:
ووتنە بە زمان، وە بەڕاست دانانە لە دڵەوە، وە کارپێکردنە بە ئەندامەکانی جەستە .

٢٤٢ - وە زیاد دەکات :بەعەمەل کردنی زۆر، وە بە قسەکردنی چاك، وە کەم دەکات : بە سەرپێچی کردن،
وە ئەو سەرەتای هەیە، دواتر زیاد دەکات بەبێ کۆتایی.
وە الله عزوجل فەرموویەتی : {ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ} [آل عمران : ١٧٣]
.وە عزوجل فەرموویەتی : {وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَـٰنًا} [المدثر : ٣١].
وە تبارك وتعالى فەرموویەتی : {لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَـٰنًا مَّعَ إِيمَـٰنِهِمْ} [الفتح : ٤].

٢٤٣ - وە معاذ بن جبل رضي الله عنه بە پیاوێك دەڵێ : دابنیشە با بۆ سەعاتێك ئیمان دار بین.
واتە : زیکری الله تعالى بکەین، ئیمان ەکەمان زیاد بکات.
وە هەموو شتێك : کە زیاد بکات ئەوا کەم یش دەکات.

٢٤٤ - دواتر اسثناء كردن له ئيمان دا، وه ئەويش ئەوەيە پياو بڵێ : إن شاء الله من ئيمان دارم.

٢٤٥ - هەر وەكو چۆن عبد الله بن مسعود رضي الله عنه دەيووت. وه هەموو ئەم عولەمايانەش لەويان وەرگرتووە، وەكو : علقمة، وه الأسود، وه أبي وائل، وه مسروق، وه منصور، وه مغيرة، وه إبراهيم النخعي، وه الأعمش، وه حماد بن زيد، وه يزيد بن زريع، وه بشر بن المفضل، وه معاذ بن معاذ، وه سفيان بن حبيب، وه سفيان الثوري، وه ابن المبارك، وه الفضيل بن عياض زۆريش هاوشێوەی وەك ئەمانە كە نايان نووسم لەبەرئەوەی كتێبەكە درێژ نەبێتەوە.
وه ئەم استثناء كردنە لەسەر يەقين ە، هەروەك چۆن الله عزوجل فەرموويەتی : {لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ} [الفتح : ٢٧].

٢٤٦ - وه رسول الله ﷺ فەرموويەتی : ئومێدەوارم كە من بەتەقواترينتان بم لەلای الله عزوجل .

٢٤٧ - وه ﷺ فەرمووی : كاتێك كە دەرچوو بۆ بەقيع فەرمووی : وه إن شاء الله ئێمەش بە ئێوە دەگەينەوە .
ئەمانە هەمووی استثناء ن لەسەر يەقين .
بەڵام دەبێت هەر كەسێك كە استثناء ی كرد : دەبێ بزانێ كە چۆن استثناء دەكات؟ وه دەبێ بزانێ بۆ استثناء دەكرێ؟ لەبەرئەوەی ئەوانەی موخالفی ئەوەن وا تێنەگەن كە استثناء كردن بۆ ئەوە دەكات كە شكی هەیە.

٢٤٨ - وه سفيان الثوري و ابن المبارك رحمهم الله دەڵێن : خەڵكی لای ئێمە ئيمان دارن بە ئەحكامەكان، وه نازانين حاڵيان چۆنە لەلای الله عزوجل، وه لەسەر چ دينێك دەمرن.

لەبەر ئەوەی استثناء کردنەکەی بۆ داهاتووە، لەبەر ئەوەی کاتێك بەندە دەڵێ : من ئیمان دارم إن شاء الله، واتە : ئەگەر الله ئیمان م لێ قبوڵ بکات، وە لەسەر ئەوە بمرێت، وەك ئەوەی کە پیاوێك نوێژ بکات، بڵێ : من نوێژم کرد، وە قبوڵ بوونی لەلای الله یە.

وە هەروەها حەج، وە هەروەها ڕۆژوو، وە هەروەها کردەوەکانی تر، کە لە کۆتاییدا هەمووی استثناء دەکرێ بۆ ئەوەی کە الله قبوڵی کردووە، نەك لەبەرئەوەی کە شکی هەبێ لەوەی کە کردوویەتی.

هەروەك چۆن پیاوێك بە پیاوێك دەڵێ کە نوێژ دەکا : نوێژت کرد؟

ئەویش دەڵێ : بەڵێ، ئەگەر قبوڵ کرابێ.

٢٤٩- وە دواتر لەدوای ئەمەوە : بزانی کە ئیسلام واتای ئیمان نییە

ئیسلام ناوێکەو، واتای : الملة.

وە ئیمان ناوێکەو، واتای : بەڕاست دانانە.

هەروەك چۆن الله عزوجل فەرموویەتی : {وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا} [یوسف: ١٧]

واتە : بەڕاستگۆمان بزانی.

وە ئایەت زۆرە کە پشت ڕاستی ئەو قسانەی ئێمە دەکاتەوە کە کردوومانە، وەکو : {قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ وَلَـٰكِن قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا} [الحجرات : ١٤].

٢٥٠ - وە پیاو لە ئیمانەوە دەردەچێت بۆ ناو ئیسلام، وە لە ئیسلام دەرناچێتە دەرەوە ئیللا بە هاوبەشی بڕیاردان بۆ الله نەبێ.

یاخود فەرزێك لە فەرزەکانی الله عزوجل ڕەتدەکاتەوە یاخود ئینکاری دەکات.

ئەگەر تەرکی کرد بە تەمبەڵی، ئەوە لە مەشیئەتی الله عزوجل ە : یان عەزابی دەدات، یاخود لێی خۆشدەبێت.

ووتم : بێجگە لەنوێژ.

٢٥١ . دواتر له دواى ئەمەوە :
بزانى بەبێ هیچ شك و گومانێك، وە بەبێ هیچ وەستانێك :
كە قورئان كەلامی اللّٰە یە وە وەحیە لەلایەن اللّٰه عزوجل، وە دایبەزاندووە كە ماناى تەوحیدی تێدایە، وە ناسینی، وە سیفاتەكان وە ناوەكانی، وە ئەو زانستێكە لە زانستەكانی اللّٰه عزوجل مخلوق نییە، وە بەهەر جۆرێك خوێندرایەوە، وە بەهەر جۆرێك نوسرا وە هەر جۆرێك تیلاوەت كرا، وە لە هەموو كاتێكدا ئەگەر لەئاسمان بوو یان لەسەر زەوی بوو یان لە لوح المحفوظ یان لە موصحەفەكان بوو یان لە لوحی منداڵەكاندا نوسرابوو یان لەسەر بەردەكان نەخشكرابوو، وە لەسەر هەر حالەتێكی تر بوو وە لە هەموو لایەنێك : ئەوە كەلامی اللّٰه یە عزوجل و مخلوق نییە.

أ . هەر كەس بڵێ : مخلوقە.

ب . یان بڵێت: كەلامی اللّٰه یە وە بوەستێت، یان گومانی هەبێ.

ج . یان بڵێ : بە زمانی من مخلوقە، یان بڵێ لە نفسی مندا مخلوقە

ئەوە كافرە بە اللّٰه عزوجل، خوێنی حەلالە، وە بەریئە لە اللّٰه وە اللّٰه ش لەو بەریئە . هەركەسێك گومانی هەبێ لە كوفری ئەم كەسە یان بوەستێت لە تەكفیر كردنی ئەوا ئەویش كافرە بە فەرموودەی اللّٰه عزوجل :
{هُوَ قُرْآنٌ مَّجِيدٌ}، {فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ} [البروج : ٢٢-٢١]

{وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ} [التوبة : ٦].
{ذَٰلِكَ أَمْرُ اللَّهِ أَنزَلَهُ إِلَيْكُمْ ۚ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا} [الطلاق : ٥]
هەر كەسێك وا گومان ببات یەك پیت لە قورئان مخلوقە: ئەوا كافرە هیچ گومانێكی تێدا نییە . وە ئایەت لە قورئان وە بەڵگەی حدیث لەلایەن مصطفى وە لەسەری زۆرە كە لە ژماردن نایەت . وە ئاشكران لەوانە نین كە شاراوە بن.

٢٥٢ . دواتر باوەڕت هەبێ بە سیفاتەکانی اللَّە تبارك وتعالى:
بەوەی اللَّە تعالى زیندووە، قسە دەکات، دەبیستێت دەبینێت، ئاشکرا و نهێنی دەزانێت، ئەوەی لە زەوی و ئاسمان دایە وە ئەوەی لەنێوانیاندایە، وە ئەوەی دیارە و شاراوەیە، وە ئەو الحكيم العليم، العزيز القدير، الودود الرؤوف الرحيم، ئەو دەبیستێت وە دەبینێت، ئەو لەسەرووی هەمووانە، وە دەگرێت وە بەردەدات، وە وەردەگرێت وە دەبەخشێت، وە ئەو لەسەر عەرشەکەیەتی جیا لە دروستکراوەکانی، وە دەژێنێت و دەمرێنێت، وە فەقیر دەکات و دەولەمەند دەکات، وە تورە دەبێت و رازی دەبێت، وە قسە دەکات و پێدەکەنێت، {لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ} [البقرة : ٢٢٥]، {وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ} [الأنعام : ٥٩]

٢٥٣ . وە دوای ئەوە بزانی : کە اللَّە عزوجل لە ڕۆژی قیامەتدا خۆی پیشانی ئیمانداران دەدات ئەوان دەبینین و ئەویش دەیانبینێت، ئەوان قسەی لەگەڵدا دەکەن و ئەویش قسەیان لەگەڵدا دەکات، سەلامیان لێ دەکات هەر وەکو اللَّە خۆی فەرموویەتی : {سَلَامٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ} [يس : 58]، وە بۆیان پێدەکەنێت، وە ئەوانیش بۆی پێدەکەنن، وە هیچ نارەحەتیەکیان نایەتە پێش لە بینینی ئەمەدا، وە هیچ گومانێکیان نابێت . هەرکەسێك ئەمە بە درۆ بزانێت، یان ڕەددی بداتەوە، یان گومانی تێدا هەبێ، یان تانە لەوکەسانە بدات کە ئەمەیان گێڕاوەتەوە، ئەوا گەورەترین درۆی بەسەر الله عزوجل وە کردووە، وە بەرێ بووە لە اللَّە وە پێغەمبەرەکەی، وە اللَّە و پێغەمبەرەکەی لەو بەریێ ن، وە عولەماکان ئەمەیان وتووە، وە هەندێکیان سوێندیان لەسەر خواردووە .

٢٥٤ . دواتر لە دوای ئەمە : ئیمانت بە قەدەر هەبێ بەخێر و شەڕەکەی، وە بەخۆش و ناخۆشیەوە، وە بەکەم و زۆرییەوە، هەمووی قەدەری اللَّە عزوجل دایناوە لەسەر بەندەکانی، لەوکاتەی کە اللَّە خۆی بیەوێ ڕوودات، نە پێش دەکەوێت کاتەکەی، وە نە دوادەکەوێت، وە ئەمە پێشتر لە علمی اللَّە دا هەبوو

وە هەر کەس بیپێکێت ئەوە بۆ ئەوە دانەنراوە کە نەیپێکێت، وە هەر کەس نەیپێکێت ئەوە بۆ ئەوە دانەنراوە کە بیپێکێت، ئەگەر پێشبکەوێت ئەوە بۆ ئەوە دانەنراوە کە دوا بکەوێت، وە ئەگەر دوا بکەوێت بۆ ئەوە دانەنراوە کە پێشبکەوێت، وە لەسەر ئەمە بەڵگەی صەحیح هەیە، وە بەڵگەی ثابت و جێگیر هەیە لە هەموو قورئاندا، وە لە هەواڵەکانی رسول الله ﷺ ئەمانە هیچیان ناتوانرێت ڕەدد بدرێتەوە، ناتوانرێت ڕەدد بدرێتەوە ئیللا بەدرۆ کردن نەبێت لەسەر الله عزوجل، وە نکۆڵی کردن لە قودرەتی الله.

دەعوەی رسولی الله بەمە بووە، وە کتێب لەسەر ئەمە دابەزیووە، وە ئەهلی تەوحید لەسەر ئەمە کۆك بوون ئەوەی دانیناوە بە ربووبیەتی الله یە، وە فریشتەکان، و پێغەمبەرە نێردراوەکان لەسەر ئەوەی هیچ شتێك نابێت، وە هیچ شتێك ڕوونادات لە ئاسمان و زەویدا، ئیللا الله عزوجل ویستی لەسەر بووە وە بڕیاری لەسەر داوە، وە دروستکراوەکان هەموویان لاوازن لە بەرامبەر هێز و توانای الله دا، ناتوانن لە نەفسی خۆیشیان شتێك بلێن کە پێچەوانەی دەسەلاتداریەتی الله عزوجل بکات، زاڵ بن بەسەر ویستی الله یە، وە ویستی الله ڕەتبکەنەوە .

ئیمان بەمە حەق و پێویستە، واجبە لەسەر دروستکراوەکانی الله عزوجل.

هەر کەسێك پێچەوانەی ئەمە بکات، یاخود لەمە دەربچێت، یاخود تانە لەمە بدات، وە مەقادرەکانی الله عزوجل جێگیر نەکات، وە مەشیئەت بگێڕێتەوە بۆلای خۆی، ئەوە سەرەتای زەندەقەیە، لەبەر ئەوەی هەواڵ دەربارەی ئەمە هاتووە : کە قدر (أبو جاد) زەندەق.

٢٥٥ . دەڵێ ﷺ : لەعنەت لە قەدەریەکان و مرجیئەکان کراوە لەسەر زمانی حەفتا لە ڕەسولەکان و من کۆتایانم .

٢٥٦ . فەرموویەتی ﷺ : الله عزوجل لە قەدری خۆیدا بەشێك لە زینای لە سەر هەموو بەندەکانی نوسیووە.

٢٥٧ . دواتر ئیمانت بە سزای قەبر هەبێت، وە بە منكر و نكیر.

٢٥٨ . وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : لەوەی گێردراوەتەوە لە البراء وە رضی الله عنە : پەنا بگرن بە الله لە سزای قەبر.

٢٥٩ . وە فەرموویەتی پێغەمبەر ﷺ : هەموو مردوویەك لەناو قەبرەكەی دادەنیشێنرێت.

٢٦٠ . وە فەرموویەتی : ئەگەر كەسێك لە گوشینی قەبر رزگاری بووایە ئەوا سعد بن معاذ رزگاری دەبوو.

| ووتم : واتە ئەویش قەبر گوشیویەتی. |
|---|

٢٦١ . وە فەرموویەتی الله عزوجل : {وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ} [طه : 124]، هەندێك لە هاوەڵانی تەفسیر دەڵێن : ئەوە سزای قەبرە.

٢٦٢ . دواتر لەدوای ئەمە : باوەرت بەراستی صوتی ئیسرافیل هەبێت (واتە فووكردن بە بوقدا) خەڵكی هەڵدەستنەوە لە قەبرەكانیان.
پێویستە لە دڵتدا بزانی كە تۆ دەمری، دواتر پرسیارت لێ دەكرێت لەقەبرەكەتدا، وە واجب و پێویست لە سەرت كە بزانی دواتر لە قەبرەكەت زیندوو دەكرێتەوە، هەر كەسێك ئینكاری ئەمە بكات ئەوا كافرە بووە.

٢٦٣ . وه رسول الله ﷺ فه‌رموویه‌تی : ئێوه هه‌ڵده‌ستنه‌وه له قه‌بره‌كانتان بۆ حه‌شر كردن به پێ خواسی و به‌بێ خه‌ته‌نه‌كراوی و به رووتی . وه الله تبارك وتعالی ده‌فه‌رمووێت : {يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَى نُصُبٍ يُوفِضُونَ} [المعارج : ٤٣]
هه‌ر كه‌سێك ئایه‌تێك به درۆ بخاته‌وه، یان پیتێك له قورئان، یان ره‌دی شتێك بداته‌وه كه رسول الله ﷺ هێناویه‌تی : ئاوا كافره.

٢٦٤ - باوه‌ڕمان به زیندووبوونه‌وه هه‌بێ، وه باوه‌ڕمان به پردی صیراط هه‌بێت، وه قسه‌ی موسڵمانان له‌و ڕۆژه‌دا ئه‌وه‌یه : رب ی سه‌لم سه‌لم.

٢٦٥ - وه‌سفی صیراط له حه‌دیث دا هاتووه : كه ئه‌و تیژتره له شمشێر، وه باریكتره له موو.

٢٦٦ - ئیمانت به كێشان و پێوانه هه‌بێ، هه‌روه‌ك الله تبارك وتعالی فه‌رموویه‌تی : {وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ} [الأنبياء : ٤٧]

٢٦٧ - ابن مسعود رضي الله عنه ده‌ڵێ : خه‌ڵكی له ڕۆژی قیامه‌تدا ده‌هێنرێن بۆ كێشان و پێوانه‌ی عه‌مه‌له‌كانیان، له‌وێدا مووناقه‌شه و مووجاده‌له‌یه‌كی زۆر ده‌كه‌ن.

٢٦٨ - رسول الله ﷺ فه‌رموویه‌تی : ته‌رازوو به‌ده‌ستی الرحمن ه، دایده‌به‌زێنێت و به‌رزی ده‌كاته‌وه
هه‌ر كه‌سێك شكی له‌مه‌دا هه‌بێت، یاخود به‌درۆی بزانێت، ئه‌وه گه‌وره‌ترین

ئیلحادی کردووه.
هەموو عولەمایانی ئەهلی علم و زوهد و عیبادەت و تەقوا کۆکن لە هەموو شووێنەکان کە : ئیمان بەمە واجبە.

٢٦٩ - ئیمانت بە حەوض، وە شەفاعەت هەبێت.

٢٧٠ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : من حەوض ێکم پێ دراوە کە پانتایەکەی لە ئیلەوە بۆ عەدەنە بەمە دەیەوێت کە پێمان بڵێت : پانتایەکەی لە ئیلەوە بۆ عەدەنە ئەم حەوضە جامی لەسەرە بەقەدەر ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان .

٢٧١ - انس بن مالك رضي الله عنه دەڵێ : هەر کەس حەوض بەدرۆ بزانێ ئەوە حەق بەدرۆ دەزانێت.

٢٧٢ - وە لە فەرموودەدا هاتووە : هەر کەس حەوض بەدرۆ بزانێت ئەوە لێی ناخواتەوە .

٢٧٣ - دواتر ئیمانت بە پرسیارکردن هەبێ کە الله عزوجل پرسیار لە عەبدەکانی دەکات لەسەر ئەوەی کردوویانە لەکەم و لەزۆر، وەلەسەر هەموو ئەو تاوانانەی کە کردوویانە.

{لِّيَسۡـَٔلَ ٱلصَّـٰدِقِينَ عَن صِدۡقِهِمۡۚ} [الأحزاب : ٨] الله عزوجل فەرموویەتی :
{فَوَرَبِّكَ لَنَسۡـَٔلَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ} [الحجر : ٩٢ , ٩٣]
حەقی ظالم لە مظلم وەردەگرێتەوە، هەتا حەقی بەرانی بێ شاخ لە بەرانی شاخ دار وەردەگرێتەوە (واتە : بەرانێك کە شاخی پێوەیە عەزێتی بەرانێك دەدات کە

شاخی پێووەنیە، حەقی ئەمەش وەردەگیرێتەوە)، مافی لاواز لە بەهێز وەردەگیرێتەوە.

٢٧٤ - ئیمانت بەوە هەبێ کە الله عزوجل بە هەشت و جەهەننم ی پێش درووستکردنی مەخلوقات درووستکردووە.
وە خۆشی و باخ و باخاتی بەهەشت بەردەوامە و هەمیشە بە جوانی و بە خۆشی دەمێنتەوە.
هاوسەرەکانی ناو بەهەشت لە حور عین ەکانن، نەدەمرن، نەلێیان کەم دەبێتەوە، نە لەناوچونیان بەسەردادێت، وە باخ و باخات و بەرووبوومەکانی کۆتاییان پێ نایەت، هەر وەکو چۆن الله عزوجل فەرموویەتی : {أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَاۚ} [الرعد : ٣٥]
سزای جەهەننم یش : بەردەوام دەبێت، خەڵکەکەی ناوی هەتا هەتایە تێیدا دەمێنەوە : هەر کەس لە دوونیادا چوبێتە دەرەوە بەبێ ئەوەی تەوحیدی هەبووبێ، ە بەبێ ئەوەی دەست گرتوو بووبێ بەسونەتەوە .
بەڵام موحیدەکان : تێدا دێنە دەرەوە بە شەفاعەت.

٢٧٥ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : شەفاعەت بۆ ئەهلی کبائر دەکەم لە ئوممەتەکەی خۆم .

٢٧٦ - دواتر ئیمانت بە ملائیکە هەبێت، وە ئیمانت بەوە هەبێت کە جبریل ئەمینی الله بووە  بۆ لای رسول ەکانی.
وە ئیمان بە ملائکە : واجب و فەرض ە.

٢٧٧ - هەروەها پێویستە لەسەرت ئیمانت بەوە هەبێت و هەموو ئەوانە پشت ڕاست بکەیتەوە کە هاتووە بۆ رسول ـەکان لەلای الله عزوجل، وە هەموو ئەوانەی الله عزوجل ووتویەتی ئەوە حەقە.
ئەگەر پیاوێك باوەڕ بە هەموو ئەوانە بێنێت کە بۆ رسول ـەکان هاتووە لە لایەن الله ـوە، وە باوەڕ بە هەموو ئەوانە بێنێت کە جبریل علیه سلام بۆ محمد ی هێناوە ﷺ لەلایەن الله ـوە ئیللا یەك شت نەبێت، ئەوە ئەو کەسە کافرە بە ئیجماعی هەموو عولەمایان.

٢٧٨ - ئیمانت بەوە هەبێت کە الله عزوجل جن ـەکانی درووستکردووە، وە جن ـەکان درووستکراوێکن لە درووستکراوەکانی الله عزوجل، درووستی کردوون بەو جۆرەی خۆی دەیەوێت، وە بۆ ئەو شتەی کە خۆیی دەیەوێت، وە ئەوان تێیاندایە موسڵمان و وە تێیاندایە کافرە، وە بەمە الله قسەی کردووە، رسول ـەکان بەمە هاتوون .
وە إبلیس ی درووستکردووە وە ئەو سەرۆکی سەربازەکانی شیطانە، وە ئەو بني آدم لە خشتە دەبات، وە وەسوەسەیان بۆ دەکات، وە تووشی فیتنەیان دەکات، وە خراپیان لەلادا باش دەکات، وە بانگیان دەکات بۆ سەرپێچی کردنی الله عزوجل، ئەو دووژمنیانە، بەناو لەشیاندا دەڕوات چۆن خوێن بەناو لەشیاندا دەڕوات، ئەو کەسانە تووشی زەرەر ناکەن کە بە توندی دەستیان بە دینی الله ـوە گرتووە.
آیات سەبارەت بەمە لە کتێبی الله عزوجل وە لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ زۆر زۆرە بەجۆرێك کە لە ژماردن نایەت.
هەر کەس ئینکاری نەبوونی جن ـەکان بکات، یاخود ئینکاری إبلیس و شیاطین بکات، وە ئینکاری ئەو ەبکات کە بني آدم گومڕا دەکەن، ئەوە ئەو کەسە کافرە بە الله عزوجل، وە ئایەتەکانی الله ی ڕەتکردۆتەوە، وە قورئانی بەدرۆ خستۆتەوە

٢٧٩ - ئیمانت بەوە هەبێت و وە ئەو شتانە وەربگریت و بەڕاستیان بزانیت کە لەلایەن عولەماکانەوە هاتوون، وە ئەوانەی کە خاوەنی متمانەن نەقڵیان کردووە لە أهلی أثار لە رسول الله ﷺ، وە وەریانگرتووە.
ئەمانە ڕەتناکرێتەوە، وە ناڵێیت : بۆچی؟ ولەبەرچی؟.
بە عەقڵی خۆت لێکی نادەیتەوە، وە قیاسی بۆ دانانێیت،
وە تەفسیری بۆناکەیت، ئیللا ئەوە نەبێت رسول الله ﷺ تەفسیری کردووە، یاخود پیاوێك لە عولەماکانی ئەم ئوممەتە کە قسەکانیان شیفایە و حوجەیە .وەکو : حەدیث ەکانی صیفات، و وە بینین.
وەك ئەمانەی کە گێڕدراونەتەوە :

٢٨٠ - الله عز وجل ئاسمانەکان دەخاتە سەر پەنجەیەکی، وە زەویەکان دەکاتە سەر پەنجەیەکی.

٢٨١ - وە الله عزوجل قاچی دەخاتە ناو جەهەنەمەوە، هەتا دەڵێ : قط قط.

٢٨٢ - وە دڵی عبدەکان لە نێوان دوو پەنجەی الرحمن دان.

٢٨٣ - وە الله عزوجل لەسەر عەرشە، وە عەرش لەبەر قورسایی الله تبارك وتعالی سەوت دەردەکات.

٢٨٤ - وە الله عزوجل نەوەکانی آدم ی هەمووی لە پشتی آدم دەرهێناوە بە دەستی ڕاستی، وە هەردوو دەستی ڕاستە و موبارەکن، وە فەرمووی : ئەمە بۆ ئەمە و هیچ منەتێکیشم نییە.

٢٨٥ - وە دەمووچاوەکان بێزراو مەکەن، چونکە الله عزوجل آدم ی لەسەر وێنەی خۆی درووست کردووە.

٢٨٦ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : الله م بینی لە وێنەی..... بەو شێوەیە. لە حەدیثی سیقە پێکراو گێڕدراوەتەوە لە صەحابەوە، وە لە عولەما بەرزو بەرێزەکانەوە، لەدوای ئەوانەوە، وەك : أبن عمر، و عائشه، وأبی هریره، وأبن عباس، وجریر بن عبدالله، وأنس بن مالك رضي الله عنهم، وبێجگە لەمان .

ووتم : ئەمە باسی خەو بینینی رسول الله دەکات ﷺ بە الله تعالی وە کە لە شێوازی گەنجێکی بێ ریشی قژ لولی قۆزدا بینیوویەتی، بەڵام ئەمە خەوە لە خەویشدا الله بەهەرجۆرێك و بەهەر شێوەیەك بێت دەتوانێت بێتە خەوی بەندەکانی . وەئەم بەشە لەناو حەدیثەکەدا کەوتوە

٢٨٧ - وە (الله تبارك الله وتعالی لە هەموو شەوێکدا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دوونیا) .
نابێت بوترێت چۆن وە بۆچی بەڵکو تەسلیمی هێزی الله دەبین، وە ئیمان بە غەیب دەهێنین.
ئەگەر ئەقڵەکانیش درکی پێنەکەن، دەبێت تۆ باوەڕی پێبهێنیت، وە ئەمە چاوی هیدایەتە، وە چاوی هیدایەت ئەوەیە کە ئیمان بەمە بهێنیت، وە تەسلیمی بیت، ئەوە بەڕاست بزانیت کە رسول الله ﷺ هێناویەتی ئەوە بنەڕەتی عیلمە، وە چاوی هیدایەتە، وە بۆ ئەم حەدیثە و هاوشێوەکانی هیچ قیاسێك ناکرێت و هیچ نمونەیەك ناهێندرێتەوە .

٢٨٨ - وە ئیمانت بەوە هەبێ عیسى أبن مریم علیه الصلاة والسلام دادەبەزێت لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی هەموو صەڵیبەكان دەشكێنێت، وە بەرازەكان دەكوژێت، وە دەعوەی یەك دەعوە دەبێت (لەگەڵ دەعوەی رسول الله ﷺ) .

٢٨٩ - وە دەجال دەردەچێت لە ئاخیری زەماندا، چاوێكی وەكو ترێیەكی وشك بوەوە وایە، وە هەموو سەر زەوی دەگەڕێت جگە لە مەككە و مەدینە .
وە عیسى أبن مریم علیه الصلاة والسلام دەیكوژێت لە باب لد لە رۆژهەڵاتی فەڵەستین، كە دووریەكەی میلێكە لە الرملە .

٢٩٠ - دواتر ئیمانت بەوە هەبێ ملك الموت علیه السلام رۆحەكان دەكێشێت، دواتر دەیگێڕێتەوە بۆ ناو جەستەكانیان لەناو قەبرەكانیان.

٢٩١ - باوەڕبوون بە فووكردن بە الصور، وە الصور ئەوەیە : كە إسرافیل علیه السلام فوو دەكات بە بوقێكدا .

٢٩٢ - وە الله عزوجل قسەی لەگەڵ موسى علیه الصلاة السلام كردووە، وە ئیبراهیمی كردووە بە خەلیلی خۆی .

٢٩٣ - وە عیسى إبن مریم علیه الصلاة والسلام رۆحی الله یە، كەلیمەی الله یە، مردووی زیندوو دەكردەوە، وە كوێر و كەڕی چاك دەكردەوە، وە لە قوڕ باڵندەی دروست دەكرد،
ئەمانە هەمووی بە قودرەت الله عزوجل ڕووی دەدا، بەویست و ئیرادەی الله بوو .

٢٩٤ - وە باوەڕبوون بەوەی کە الله عزوجل آدم عليه الصلاة والسلام ی بەدەستی خۆی دروست کردووە، وە بەهەشت و فیردەوسی بەدەستی خۆی دروست کردووە .

٢٩٥ - وە ئەمەی گێڕدراوەتەوە : ئەی نەوەی آدم ئەگەر تۆ یادم بکەی لەنەفسی خۆتدا، منیش لەنەفسی خۆمدا یادت دەکەم، وە ئەگەر یادم بکەی لەناو کۆمەڵێکدا، ئەوا من لەناو کۆمەڵێکی خێرتر و چاکتردا یادت دەکەم .

٢٩٦ - ئەوەی گێڕدراوەتەوە : هەر کەسێك بستێك لێم نزیك بێتەوە، من قۆڵێك لێی نزیك دەبمەوە، وە هەر کەس قۆڵێك لێم نزیك بێتەوە، ئەوا من دوو قۆڵ لێی نزیك دەبمەوە، وە هەر کەسێك بە ئاسایی بێت بۆلام من بەڕاکردن دەچم بۆلای .

٢٩٧ - الله عزوجل سەرسامە بە گەنجێك کە مەیلی نەبێ بۆ هەواو ئارەزوو.

٢٩٨ - فەرموویەتی ﷺ : پەروەردگارمان پێدەکەنێت، بە بەندەیەك کە گەشتۆتە ئەوپەڕی نارەحەتی لە کاتێکدا الله نزیکە و حاڵەکان دەگۆڕێت .
ئەو قسەیەی دەفەرمووێت : هیچ نابینی لە پێکەنینی الله عزوجل ئیللا خێر نەبێ .

٢٩٩ - فەرموویەتی ﷺ : جنێو بە زەمانە مەدەن، چونکە الله زەمانەیە .

٣٠٠ - نێوان زەوی و ئاسمان پێنج سەد ساڵە، وە هەر ئاسمانێك خۆی پێنج سەد ساڵە، وە نێوان هەر ئاسمانێك پێنج سەد ساڵە .
وە هەموو ئەو حەدیثانە، وە هەموو هاوشێوەكانی وەردەگیرێت چۆن گێڕدراوەتەوە هیچ نموونەیەكی بۆ ناهێندرێتەوە، وە هیچ قسە و مووناقەشەیەكی تێدا ناكرێت .
وە عولەما گەورە و بەرێزەكان ئەوانەی خاوەنی سیقەن ئەوانەیان گێڕاوەتەوە، وە قبوڵیان بووە، وە وازیان لەتەفسیر كردنی هێناوە، وە عیلم لەم بابەتەدا ئەوەیە : كە قسە نەكەیت لە ماناكەیدا.

٣٠١ - دواتر ئیمانمان بەوە هەبێ كە قورآن دەپارێزرێت لە سینگی پیاوەكاندا، هەر كەس قورآن ی لەبەركرد ناوی لێدەنرێ : هەڵگری كتابی الله عزوجل .

٣٠٢ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : هەر پیاوێك قورآن ی لەبەر نەكردبێت وەك مالێك وایە كە ڕووخابێت .

٣٠٣ - رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : بوغرا نەبن بە موصحەفە هەڵواسراوەكان، الله عزوجل دلێك عەزاب نادات (بەئاگر) كە بەئاگا هاتبێتەوە بە قورآن.

٣٠٤ - وە باوەڕبوون بەوەی كە موسى قسەی لەگەڵ ملك الموت كردووە (فریشتەی گیان كێشان)، وە ئەو لێی داوە، ئەو حدیثانە ڕەتناكەینەوە كە لەوبارەیەوە هاتوون وە هیچ كەسێك نكۆڵی لەم حدیثانە ناكات ئیللا بیدعەچیەكی بۆچوون لاواز نەبێ .
عولەماكان ئاوا قسەیان تێدا كردووە وە تێیدا وەستاون .

ووتم : ئەمە باسی ئەو ڕووداوە دەکات کە ملك الموت هاتبوو بۆلای پێغەمبەر موسی علیه الصلاة و السلام بۆ ئەوەی ڕۆحی بکێشێ، پێغەمبەر موسی لە ملك الموت ی داوە و چاوێکی کوێر کردووە، دواتر ملك الموت گەڕاوەتەوە بۆلای الله تعالی وە الله چاوی چاك دەکاتەوە ملك الموت دەڵێ : یا الله تۆ منت ناردووە بۆلای عەبدێکت کە نایەوێ بمرێ، ئینجا الله تعالی فەرمانی پێدەکات کە بگەڕێتەوە بۆلای و پێی بڵێ دەستبخاتە سەر گایەك چەنێك موو لەژێر دەستیدا مایەوە ئەوندە ساڵەی تر دەژی، یاخود ئەوکاتە بمرێ، پێغەمبەر موسی ئەوە هەڵدەبژێرێ کە لەوکاتەدا بمرێ .

٣٠٥ - وە وتەی پێغەمبەر ﷺ : هیچ کەسێك نییە ئیللا قەڕینێکی لە جن بۆ دانراوە، (قەڕین : مەخلوقێکی الله تعالی یە لەجنسی جنە هەموو مرۆڤێك قەڕینێکی لەگەڵدایە)
ووتیان : تۆش یا رسول الله؟
فەرمووی : منیش ئیللا ئەوە نەبێ الله منی سەرخست بەسەریدا مسوڵمان بوو، هیچ فرمانێکم پێ ناکات ئیللا بەخێر نەبێ.

٣٠٦ - پێغەمبەرمان ﷺ یەکەمی پێغەمبەران بووە کە دروستکراوە، وە ئاخیریشیان بووە کە نێردراوە .
دایکی کاتێك پێغەمبەری بوو نورێکی بینی کە کۆشکەکانی شامی ڕووناك کردەوە .

٣٠٧ - وە هەر کەسێك بیروباوەڕی وابێت کە پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی بنێردێت بە ڕیسالەکەی لەسەر دینی گەلەکەی بووە، ئەوە گەورەترین درۆی بەسەر رسول الله ﷺ کردووە، وە قسە لەگەڵ خاوەن ئەم قسەیەدا ناکرێ، وە لەگەڵی دانانیشرێت .

٣٠٨ - وە دەڵێین : پێغەمبەرمان ﷺ بە خەتەنەکراوی و ئاسودەیی لەدایك بووە.

٣٠٩ - رسول الله ﷺ دواوەی خۆی دەبینی وەك چۆن پێشەوەی خۆی دەبینی .

٣١٠ - ئەو سواری براق بووە (براق : ئەو ئاژەڵە بوو کە پێغەمبەرمان ﷺ سواری بووە لەمەککەوە پێی رۆیشتووە بۆ البیت المقدس)، وە هاتووە بۆ البیت المقدس لەو شەوەدا (واتە شەوی إسرا والمعراج)، دواتر بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان، تاکو نزیك بۆتەوە لە الله وە الله تعالی دابەزیووە بۆلای، بەجۆرێك لێی نزیك بۆتەوە کە نێوانی دووریەکەیان بەنزیکەی دوو کەوانە بووە.

ووتم : ئەمە باسی سورەتی النجم دەکات، ئایەتی {ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى (٨)}، {فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى (٩)﴾،
سەلەف چەند تەفسیرێکیان بۆ ئەم ئایەتانە هەبووە :

١ - ئەوەی کە لێرەدا ابن بطة خۆی هێناویەتی ئەوانەی کە بەوە تەفسیریان کردووە الله تعالی محمد ی ﷺ لەخۆی نزیك کردۆتەوە تا نێوانی دووریەکەیان دوو کەوانە یان کەمتر بووە ئەوانیش : ابن عباس، انس بن مالك کۆمەیەڵێکی تر لەهاوەڵان .

٢ - ئەوانەی بەوە تەفسیریان کردوە کە ئەوە جبریل بووە لەشێوازی ڕاستی خۆیدا ئەوندە لە پێغەمبەر ﷺ نزیك بۆتەوە کە ئەندازەی دووری نێوانیان دوو کەوانە یان کەمتر بووە، ئەوانەی بەو جۆرە تەفسریان کردووە ئەوانیش : دایکمان عائشة، ابن مسعود، الحسن البصري، قتادة، الربيع .

٣ - ئەوانەی بەوە تەفسریان کردوە کە الله جبرئیل ی ئەوندە لەخۆی نزیك کردۆتەوە کە ئەندازەی دووری نێوانیان دوو کەوان یان کەمتر بووە، ئەویش : مهاجد کۆمەلێکی تر بەو جۆرە تەفسیریان کردووە.

قەوسین (کەوانە) : هەندێك لە سەلەف بە دوو زراع وە هەندێکی تر لەسەلەف بە زراع ێك تەفسیریان کردووە.

٣١١ - وە الله عزوجل دەستەکانی خستۆتە بەینی شانەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە هەستی بەساردی کردووە لەبینی سینگیدا، لەو دەستخستە سەر شانەی دا زانستی سەرەتا و کۆتایی فێرکردووە .

٣١٢ - وە ڕۆژی قیامەت دێت وە پێغەمبەر ﷺ لەبەڕێزترینی پێغەمبەرانە، بەرزترینیانە لەپلەدا، وە نزیکترینە لە الله عزوجل، وە خۆشەویسترینیانە لای الله، داوای شەفاعەت دەکات و شەفاعەت دەکات، وە داوا دەکات و پێی دەدرێ .

٣١٣ - وە لەگەڵ الله عزوجل لەسەر عەرشەکەی دادەنیشێت، ئەمە بۆئەوە و بۆ هیچ کەسێکی تر نییە، وە ئەوە گێردراوەتەوە لە نافع لە ابن عمر لە پێغەمبەرەوە ﷺ : {عَسَىٰ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا}[سورەتی الإسراء ٧٩]، ووتی : دایدەنیشێنێت لەگەڵ خۆی لەسەر عەرشەکەی.

٣١٤ - مجاهد بەم جۆرە تەفسیری کردووە چۆن گێڕدراوەتەوە لە محمد بن فضيل ەوە، لە ليث ەوە.

٣١٥ - دواتر ئیمانت بەوە هەبێت وە بزانی باشترین دروستکراوی الله و بەرزترین پلە لای الله عزوجل لەدوای پێغەمبەرانەوە، وە شایستەترین کەس بۆ جێگرەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەوا ابو بكر الصديق ە رضي الله عنه، عبد الله بن

عثمان، وه عتيق أبي قحافة.
وه پێویسته بزانی ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد هیچ کەسێك نەبوو لەسەر ئەم زەویەدا ئەو وەسفانەی تێدا بێت کە ئێمە باسمان کرد ئیللا لەئیمامی ابو بکر دا هەبووە ڕەحمەتی اللە ی لێبێت .
دواتر لەدوای ئەوەوە (واتە لەدوای ابو بکر) ەوە لەسەر ئەم وەسفە (واتە ئەو وەسفانەی پێشوو کردمان) : أبو حفصٍ عمر بن الخطاب رضي الله عنه، وهو الفارُوق .
دواتر لەدوای ئەوەوە (واتە لەدوای عمر) ەوە لەسەر ئەم وەسفە : عثمانُ بنُ عفَّان رضي الله عنه، وهو أبو عبدِ الله، وأبو عَمرو ذو النُّورينِ (خاوەن دوو نورەکە، هاوسەری دوو کچی پێغەمبەر ﷺ).
دواتر لەسەر ئەم وەسفانە لەدوای ئەوانەوە ابو الحسن علي بن أبي الطالب رضي الله عنه، ئەو خۆپارێز بووە (لێرەدا ئەم الأنزع ە مەبەست پێی ئەوەیە کە علي خۆی پاراستوە لەشیرك پێش ئەوەی مسوڵمانیش بێت)، وە زاوای رسول الله ﷺ بووە، وە ئامۆزای بووە، سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی الله لەسەر هەموویان بێت.
وە خۆشەویستنیان و زانینی فەزڵیان، بەمە دینت ڕاگرتووە، وە سونەت تەواو دەکەیت .

٣١٦ - سفيان الثوري رحمە اللە ووتی : جنێو بە سەلەف مەدە، و بەسەلامەتی بچۆ بەهەشتەوە .

٣١٧ - وە شایەتی دەدەین بۆ دە کەس بەبێ شك و گومان، وە بەبێ استثناء، وە ئەوانە هاوڵانی ئەشکەوتی حەڕای پێغەمبەرن ﷺ، أبو بكر، وە عمر، وە عثمان، وە علي، وە طلحة، وە الزبير، وە سعد، وە سعيد، وە عبدالرحمن بن عوف، وە أبو العبيدة بن الجراح .
لەم کەسانە هیچ کەسێکیان پێش ناخەین لەفەزڵ و چاکە دا .

٣١٨ - وه شایەتی دەدەین بۆ هەرکەسێك کە پێغەمبەر ﷺ شایەتی بۆ دابێ بەبەهەشت .
وه حمزة : گەورەی شەهیدەکانە .
وه جعفر الطیار : لە بەهەشتدایە .
والحسن والحسین : گەورەی گەنجەکانی بەهەشتن.

٣١٩ - وه شایەتی دەدەین بۆ هەموو موهاجرین (هاوەڵە کۆچبەرەکان) وه هەموو أنصاریەکان (هاوەڵە نیشتەجێیەکانی مەدینە) بەبەهەشت و ڕەزامەندی الله، وه بەتەوبە و ڕەحمەتی الله بۆیان.

٣٢٠ - وه زانستەکە جێگیر دەکەیت، وه دڵەکەتی لەسەر جێگیر دەکەیت، ئەگەر هاتوو پیاوێك پێغەمبەری بینیبوو وه شایەتی بۆ دابوو و باوەڕی پێ هێنابوو و شوێنی کەوتبوو، وه ئەگەر ئەم بەیەکگەیشتنە یەك سەعات بووبێ لەنیوەڕۆدا ئەوا لەهەموو ئەوانە باشترە کە نەیانبینیووە، ئەگەر هاتوو ئەو کەسە هەموو کاروو کردەوەیەکی دروستکراوەکانیش ئەنجامی بدات .

٣٢١ - دواتر ڕەحمەت بنێری بۆ هەموو هاوەڵانی رسول الله ﷺ : بچووك و گەورەیان، یەکەم و کۆتاییان، وه چاکەکانیان باس بکەیت، وه فەزڵیان بڵاوبکەیتەوە، وه شوێنکەوتنی ئەوەی کەهێناونیانە، وه شوێن ئەثەریان بکەویت، وه حەق هەموو ئەوەیە کە ئەوان وتوویانە، ڕاست ئەوەیە کە ئەوان کردوویانە .

٣٢٢ - هەموو زانایان کۆکن و هیچ خیلافێك لەنێوانیان نییە لەسەر ئەوەی : هیچ کەسێك تەکفیر ناکەن بەئەنجامدانی تاوان، وه لەبازنەی ئیسلام دەری

ناکەن بەهۆی سەرپێچیکردنی الله ەوە، وە ئومێدی باشمان پێی هەیە، وە دەترسین لە خراپەی.
وە ئێمە وەك موعتەزیلەکان نالێین لەمەدا کە ئەوان دەڵێن هەر کەسێك یەك گوناه ئەنجام بدات لەهەموو ژیانیدا، یاخود یەك زوڵم و ستەم ئەنجام بدات لەهەموو ژیانیدا کافر بووە .
هەر کەسێك ئەمە بڵێت ئەوا گەورەترین درۆی بەسەر الله دا کردوە، وە الله ی بێبەش و بەرێ کردوە لەوانەی وەسفی خۆی پێ کردوە : کە سیفەتی ڕەحمت، وە لێخۆش بوون، وە وەرگرتنی تەوبەکان .
وە گومانی بردوە کە پێغەمبەران و آدم، وە بێجگەلە ئەوان کافر بوون .
الله تعالی فەرموویەتی : {وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ} [طه : ١٢١]
وە لە زۆر شوێنی قورآن دا الله باسی تاوانی پێغەمبەرانی کردوە سەلامی الله یان لەسەر بێت.
وە براکانی یوسف زوڵم و ستەمیان لەبراکەیان کرد، وە سزای باوکیان دا، وە سەرپێچی گەورەکەیان کرد، وە ئەوان لەگەڵ ئەوەدا هەڵبژێردراوانێکی پاکن، وە ئەوان ئەهلی بەهەشتن.
الله عزوجل بە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : {لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ} [الفتح : ٢].
الله دەفەرمووێت : {عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ} [التوبة : ٤٣].

٣٢٣ - وە لە دوای ئەوە
واز لەو شتانە بهێنین کە لەنێوانی هاوەڵانی رسول الله ﷺ ڕوویداوە، وە خۆی شایەتی بۆ داون لەگەڵیاندا، وە فەزڵی داون بەسەر هەموو خەڵکیدا، الله لێیان خۆش بووە، فەرمانی کردووە بەوەی داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەین، وە لە الله نزیك ببینەوە بە خۆشویستینیان، وە ئەمەی واجب کردووە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ، وە دەیزانی کە ئەوان چی دەکەن، وە یەك دەکوژن، وە لەگەڵ ئەوەشدا فەزڵی داون بەسەر هەموو دروستکراوەکانی تردا، لەبەر ئەوەی

هەر هەڵەیەك و کەموکورِیەکیان کردووە لەشەڕ کردنێکیش لەنێوان خۆیاندا الله تعالی لێیان خۆش بووە .
وە سەیری کتێبەکانی و صفین و جمل ناکەین, (شەڕ و ناکۆکیەك بوو لەنێوان هاوەڵان ڕوویدا)، وە ئەو بەربەرەکانیانەی تریش کەلە نێوانیاندا ڕووی داوە .
وە ئەو شەڕانە بۆ خۆت مەنوسەوە بۆ جگەلە خۆتیشی مەنوسەوە، وە لەهیچ کەسێکی مەگێڕەرەوە، وە بەسەر هیچ کەسێکدا مەیخوێنەوە، گوێ لەهیچ کەسێك مەگرە کە بۆتی گێرایەوە .
وە هەموو ئیمامە بەڕێزەکانمان لەسەر ئەو شتە کۆبوونەتەوە و نەهیان لێکردوە کەئێمە باسمان کردوە : حمَّادُ بنُ زيدٍ، ويُونسُ بنُ عُبيد، وسفيانُ الثوري، وسفيانُ ابنُ عيينة، وعبد الله بنُ إدريس، ومالك بن أنسٍ، وابنُ أبي ذِئبٍ، وابنُ المُنكدِرِ، وابنُ المُباركِ، وشعيبُ بنُ حربٍ، وأبو إسحاقَ الفزاريُّ، ويوسفُ بنُ أسباطٍ، وأحمدُ بن حنبلٍ، وبشرُ بن الحارثِ، وعبد الوهَّابِ الورَّاقُ .
هەموو ئەوانەی ناومان هێنان وایان بینیووە کە ڕێگری لەم شتە بکرێت، ڕێگری لە سەیرکردنی بکرێت، ڕێگری لە گوێ گرتنی بکرێت.
وە ئاگاداری ئەوانە بن کە داوای ئەمە دەکەن، وە ئەوانەی کە گرنگی دەدەن بەکۆکردنەوەی ئەم بەسەرهاتانە .
وە لێیانەوە گێردراوەتەوە کۆمەلێك بابەت بەوشەی جیاواز، بەڵام لەماناداکۆکن کە ئەم بابەتە ڕێگری لێکراوە، وە نکۆڵیان لەو کەسە کردوە کە ئەمە دەگیرێتەوە و گوێ لەمە دەگرێت.

٣٢٤ - دواتر لەدوای ئەمەوە : شایەتی بدرێ بۆ عائشە ی کچی ابي بكر الصديق الله لێیان ڕازی بێت کە ئەو ڕاستگۆیە، وە پاکە، لەسەر زمانی جبريل بەرەییە لەو شتانەی کەدراوەتە پاڵی (لەو بوختانەی کە بۆی کراوە) هەواڵی پێدراوە لەلایەن الله ەوە عزوجل گێڕاوەتەوە، وە لەسنگی پێشەواکان پارێزراوە و لە مصحەفەکاندا پارێزراوە هەتاوەکو ڕۆژی قیامەت، کە ئەو هاوسەری پێغەمبەرە ﷺ، بەریە لەو تاوانانەی دراونەتە پاڵی، پاکە، چاکە، وە فەزڵی هەیە، وە ئەو هاوسەری

پێغەمبەرە ﷺ، وە هاوڕییەتی لەبەهەشتدا، وە ئەو دایکی بڕوادارانە لەدونیا و قیامەتدا .

هەر کەس شك و گومانی لەمە هەبێ، یاخود تانە و تەشەرەی لێبدا، یاخود لەسەری بوەستێ، ئەوا درۆی کردوە بەسەر کتابی الله ەوە عزوجل، وە گومانی هەبووە بەوەی کەلەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە، وە گومانی بردوە کە ئەمە لە لایەن الله وە نییە عزوجل، الله فەرموویەتی : {يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ} [النور: ١٧] .

وە هەر کەسێك نکۆڵی و ئینکاری ئەمە بکات : ئەوا بەری بووە لە ئیمان.

٣٢٥ - وە هاوەڵانی رسول الله مان ﷺ خۆشبووێت بەپێی پلەبەندەیەکانیان لەیەکەمەوە : هاوەڵانی بدرٍ، والحُديبيةَ، وبيعة اِلرَّضوان، وأُحُدٍ .

ئەمانە هەموویان پلەیان بەرزە و بەڕێزن، وە خاوەنی فەزڵن، ئەمانە پێش هەموو کەس کەوتوون لەڕەزامەندی الله دا، الله لە هەموویان ڕازی بێت .

٣٢٦ - وە ڕەحمەت دەنێرین بۆ أبي عبد الرحمن معاوية بن أبي سفيان، برای أم حبيبة ی دایکی ئیمانداران و هاوسەری رسول الله ﷺ، خاڵی هەموو مسڵمانان، وە نوسەری وەحی. وە باسی فەزڵی دەکرێت، وە بەس ئەوە دەگێردێتەوە کە رسول الله ﷺ لەسەری وتووە.

٣٢٧ - ابن عمر رضي الله عنه دەڵێ : ئێمە لەگەڵ رسول الله ﷺ بووین ووتی : پیاوێك دێتە ژوورەوە لە ئەهلی بەهەشتە . معاوية هاتە ژوورەوە رحمه الله .

بزانە ئەمە شوێن و پلەوپایەتی .

٣٢٨ - دواتر لەپێناو الله ـدا ئەو کەسەت خۆشبووێ کە گوێڕایەڵی دەکات، وە ئەگەر هاتوو ئەو کەسە لەتۆ دوور بوو، وە لە دونیادا موخالەفە و پێچەوانەی تۆ بوو . لەپێناو الله ـدا ڕقت لەو کەسە بێت کە سەرپێچی دەکات، وە گەر هاتوو ئەو کەسە لە تۆ نزیك بوو، وە ئەگەر هاتوو موافەقەی هەواو ئارەزووی تۆ بوو لەدونیادا، وە لەسەر ئەوە پەیوەندی لەگەڵدا دروست دەکەی، وە لەسەر ئەوە پەیوەندی لەگەڵدا دەپچڕێنیت .

٣٢٩ - وە بەرەئی و بۆچوون قسە مەکە، گوێ بۆ کەسێك مەگرە کە بەرەئی و بۆچوون قسە دەکات، لەبەر ئەوەی رەئی و بۆچوون هەندێکجار دەیپێکێت و هەندێکجار نایپێکێت.

٣٣٠ - لەگەڵ هاوەڵانی خصومات و جیدال و بەربەرکانێ دامەنیشە، ئەوان بەربەرەکانی و موجادەلە دەکەن لە ئایەتەکانی الله.

٣٣١ - ئاگاداری مووناقشە موجادەلە کردن بە لەدیندا، چونکە حەسودی دەهێنێ بۆ دڵ، خاوەنەکەی دەر دەکات لە ئەهلی سوننە بۆ ئەهلی بیدەع، لەبەر ئەوەی یەکەم شت کە کەمووکوڕی تێدەکەوێ لە دینی کەسی سونەدا مووناقشە و موجادەلەیە لەگەڵ کەسی ئەهلی بیدەعدا .

أ - دانیشتن لەگەڵ موبتەدیع و مناظرة کردن لەگەڵی.

ب - دواتر دڵنیا نابی لەوەی کە چ قسەیەك دەچێتە ناو دڵییەوە، چ قسەیەکی پیس دەچێتە ناو دڵتەوە و تووشی فیتنەت دەکات.

ج - ئەگەر تووشی فیتنەشی نەکات، ئەوا کۆمەڵە ڕائیەك دەخاتە دڵییەوە کە هیچ بنچینەیەکی نییە لە تەئویلدا، وە هیچ بەرچاو ڕوونیەکی نییە لە دابەزیندا،

وە هیچ ئەثەرێکی لەسەر نییە لەسەر ئەو هەواڵانەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی داوین .

٣٣٢ - لە دوای ئەمەوە :
وازهێنان لە فیتنەکان و بەژداری نەکردن تیایاندا، دەرنەچوون لە دەسەڵاتی سوڵتان بە شمشێر ئەگەر زوڵمیشیان کرد .

٣٣٣ - عمر بن الخطاب رضي الله عنه فەرموویەتی : ئەگەر ستەمی لێکردی ئارام بگرە، و ئەگەر لێی زەوت کردی ئارام بگرە .

٣٣٤ - رسول الله ﷺ بە ابو ذری فەرموو رضي الله عنه : ئارام بگرە گەر سوڵتان بەندەیەکی حەبەشیش بوو.

٣٣٥ - هەموو عولەماکان ئەوانەی ئەهلی عیلم و زانست و فیقه و زوهد و عیبادەتن لەسەرەتای ئوممەت تا ئێستا کۆکن لەسەر ئەوەی کە نوێژی هەینی، نوێژی دوو جەژنەکە، مینا، عەرەفات، غەزاکان، حەج، لەگەڵ هەموو ئەمیرێکدا دەکرێ چاکەکار بێت یاخود خراپەکار، باج و خەراج و خێرەکان و فەیئەکانیان پێدەدرێت .
نوێژکردن لەو مزگەوتانەی ئەوان دروستیان کردووە.
ڕۆشتن بەسەر ئەو پردانەی ئەوان دروستیان کردووە.
کڕین و فرۆشتن، بازرگانی کردن، کشتوکاڵ کردن، گشت کارێك لەهەموو سەردەمێکدا، لەگەڵ هەموو دەسەڵاتدارێکدا دروستە ئەگەر بەپێی قورآن و سوننەت بێت .
زوڵمی هیچ زاڵمێك تاوانی هیچ تاوانبارێك زیان بەو کارانە ناگەیەنێ ئەگەر لەسەر

حوكمی قورئان و سوننەت بێت وەك چۆن لەسەردەمی ئیمامێكی دادپەروەردا كڕین و فرۆشتنێك بكرێت پێچەوانەی قورآن و سوننە بێت ئەوا دادپەروەری ئەو ئیمامە هیچ سودێك بەو كەسە ناگەیەنێ كە ئەو كارە دەكات.
حوكم و بڕیاردان لەنێوان خەڵكدا، جێبەجێكردنی سنوورەكان، قیصاصەكان، لێسەندنەوەی حەق لەستەمكار هەمووی بەفەرمانی ئەوانە.
گوێڕایەڵی كردنی سوڵتان ئەگەر بەندەیەكی حەبەشیش بوو، تەنها لە كارێكدا نەبێ كە بێ فەرمانی الله بوو چونكە گوێڕایەڵی هیچ كەس ناكرێ لە سەرپێچیكردنی فەرمانی الله .

٣٣٦ - لەدوای ئەوەشەوە :
دەبێ باوەڕمان وابێت كە ئامۆژگاری ئیمام بكرێ، وە هانبدرێت بۆ كاری چاكە لەدین و دونیادا، پێویستە چاكە و خۆشیت بۆ گشت موسوڵمانێك بووێت، ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ گشت موسوڵمانێك پێت خۆشبێت، وە ئەوەشی بۆ خۆت پێت ناخۆشە ئەبێ بۆ هەموو مسوڵمانان پێت ناخۆشبێت.

٣٣٧ - پرس و ڕاوێژ بە هیچ كەسێكی ئەهلی بیدەع مەكە لەدینەكەتدا، و هاوڕێیەتیان مەكە لەسەفەردا، ئەگەر توانات هەبوو دراوسێیەتیان مەكە .

٣٣٨ - وە لە سوننەتە: لە هەموو ئەو كەسانە دوور بكەویتەوە كە عەقیدەیان پێچەوانەی ئەو عەقیدانەیە كە ئێمە باسمان كرد، هەجریان بكەیت، وە ڕقت لێیان بێت، هەجری ئەو كەسانەش بكەیت كە لەگەڵ ئەوانن و پشتیوانی ئەوان دەكەن، هاوڕێكانیان لەخۆت دووربخەیتەوە، ئەگەر هاوڕێكانیشیان كردارەكانیان بە ڕووكەش وەك ئەهلی سوننە بێت.

وە لەسوننەتە :

٣٣٩ - بەرزکردنەوەی دەست لەناو نوێژدا : لەکاتی دەستپێکردنی نوێژدا، وە لەکاتێکدا دەچیت بۆ ڕکوع، وە لەکاتێکدا کە سەرت لەڕکوع بەرزدەکەیتەوە، وە ئەوەش زیادەیە لە چاکەکان.

٣٤٠ - رسول الله صل الله عليه وسلم فەرموویەتی : بە هەموو ئاماژەیەك چاکەیەکت بۆ دەنووسرێت.

وە لە سوننەتە:

٣٤١ - مەسح کردن لەسەر خوفەین، (گۆرەوی و هاوشێوەکانی)، دەبێت کاتێك لەپێی کردبێت دەستنوێژی هەبووبێ :
ئەگەر گەشتیار بوو : سێ ڕۆژ دەتوانێت مەسحی لەسەر بکات، ئەگەر هاتوو نیشتەجێ بوو شەو و ڕۆژێك دەتوانێ مەسحی لەسەر بکات .
بەم جۆرە بووە سوونەتی رسول الله ﷺ و وە کرداری هاوەڵەکانی .
وە موسوڵمانانی سەرەتا لەسەر ئەم سوننەتە ڕۆشتوون، وە عولەماکانیش ئەوەیان وەرگرتووە، هیچ کەسێك ئەمە ڕەتناکاتەوە تەنها موبتەدیع نەبێ، موخالەفەکەری رسول الله ﷺ پشتکەر لەسوونەتەکەی، ڕەددەرەوەی قسەکانی .

وە لە سووننەتە :

٣٤٢ - پەلەکردن لە ڕۆژوو شکاندن، وە دواخستنی پارشێوو.

٣٤٣ - وە کردنی نوێژی مەغریب دوای ئاوابوونی خراپی خۆر لەپشت شاخەکانەوە، پێش دەرکەوتنی ئەستێرەکان.

٣٤٤ - فەرموویەتی ﷺ : ئوممەتەکەم لە خێردا دەمێننەوە تا پەلە بکەن لە ڕۆژوو شکاندن، وە پارشێوو کردنیش دوابخەن.

٣٤٥ - فەرموویەتی ﷺ : خەڵکی لەسەر چاکە و خێرن هەتا ئەو کاتەی نوێژی مەغریب دوانەخەن بۆ کاتێك کە ئەستێرەکانی تێدا دەردەکەوێ.

٣٤٦ - سليمان بن داود الاودي دەڵێ : نوێژی مەغریبم لەگەڵ علي بن أبي طالب رضى الله عنه دەکرد، وە نەمدەزانی ئایا خۆر ئاوابووە، یان ئاوانەبووە.

٣٤٧ - وە لە سوونەتی تەڵاقدانی هاوسەر :
بەو جۆرەیە کە تەڵاقی نەدات تەنها بەیەك تەڵاق نەبێت، ئەویش لەوکاتەدا کە پاك بووبێتەوە لە حەیضدا (سوڕی مانگانە)، و لەوکاتەشدا کە تەڵاقی دەدات بە هیچ جۆرێك نەچێتەوە بۆلای هەتا ئەوکاتەی عیددەکەی تەواو دەبێت .
بەڵام ئەگەر هەر سێ تەڵاقەکە بەیەك قسە بخات ئەگەر پاك بێت یاخود لە حەیضدا بێت، ئەوا تەڵاقی داوە بە تەڵاقدانێکی بیدعەیی، و تەڵاقەکەی دەکەوێت و ئەو ئافرەتە لەسەری حەڕام دەبێت، هەتا ئەو ئافرەتە شوو بەپیاوێکی تر دەکات، و ئەو پیاوە تەڵاقی دەدات دوای ئەوەی چۆتە لای یاخود دەمرێت.

وە لە سوووننەتە :

٣٤٨ - تەكبیرە لێدان لە نوێژی مردوودا چوار تەكبیر لێدەدەیت .

٣٤٩ - ئەگەر ئیمامەكە تەكبیرەی زیاتری لێدا، لە سوننەت ئەوەیە تۆش وەك ئەو تەكبیرە لێبدەی دوای ئەوەی كە تۆ وای دەبینی چوار تەكبیرە كۆتاییە .
ابن مسعود رضی الله عنه دەڵێ : ئەوندە تەكبیرە لێبدەن كە ئیمام لێی دەدات.

وە لە سوووننەتە :

٣٥٠ - ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ بشاردرێتەوە .

ووتم : مەبەست لێی ئەو نوێژانەیە كە بە جەماعەت دەكرێن، وە قورئان بەدەنگی بەرز تێیدا دەخوێندرێتەوە، پێویستە ئەوكەسەی پێشنوێژی دەكات ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ بشارێتەوە لەكاتی خوێندنی سورەتی (الفاتیحە) بە {الحمدلله رب العالمین} دەستپێبكات.

٣٥١ - وە قنوت نییە لە نوێژی (بەیانیان)، تەنها لە كاتێكدا نەبێ موسوڵمانان تووشی كێشەیەك دەبن لەگەڵ دووژمنەكانیان لەوكاتەدا ئیمام قنوت دەكات، ئەوانی تر شوێنی دەكەون .

٣٥٢ - وە نوێژی ویتر ركعاتێكی جیاوازە لەنوێژەكانی پێشووترییەوە كە دەكرێت (واتە پێش ویترەكە) .

٣٥٣ - قنوت لە نوێژی ویتردا لە دوای ڕكووع ەوەیە .

وه لە سوونەتە :

٣٥٤ - قامەت کردن بە یەك یەك .

ووتم : تەنها لە وشەی قد قامة صلاة، قد قامة الصلاة دا نەبێت کە ئەویان دووجار دەوترێت .

وە لە سونەتە :

٣٥٥ - هەرکاتێك چوویتە مزگەوت دوو رکعات نوێژ بکەی پێش ئەوەی دابنیشیت، ئەگەر هاتوو دەستنوێژت هەبوو، وە ئەگەر ڕۆژی جومعە بوو ئیمامیش وتاری دەدا .

وە لە سونەتە :

٣٥٦ - ئیمام وتاریدا بەجوانی و بەباشی گوێی لێبگریت.

٣٥٧ - وە ڕوو بکەیتە ئیمام کاتێك وتاری بۆ دەدایت، جا ئەگەر ڕووبەڕووی بوویت یاخوود ڕووبەڕووی نەبوویت، وە بەباشی گویٚ بگریت .

٣٥٨ -رسول الله صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت:
هەرکەسێ بڵێ صه، وە لەوکاتە ئیمام وتاری ئەدا، ئەوە قسەی کردوە، وە هەرکەسێ قسەبکات جومعەی بۆ نیە .

٣٥٩- ودەفەرمووێت : هەرکەسێ قسەبکات لەوکاتەی کە ئیمام وتار ئەدات، ئەوە وەك گوێدرێژێك وایە کەباریهەڵگرتبێ .

٣٦٠ - فەرموویەتی ﷺ : هەر کەسێك قسە بکات لەوکاتەی کە ئیمام وتار دەدات، پاداشتی جومعەکەی : وەکو کەڤی دەریا وایە .

٣٦١ - سەلام بکەیت هەر کاتێك چوویتە ناو مزگەوتەوە، و هەرکاتێك چوویتە دەرەوە.

٣٦٢ - شتێك حەرام مەکە کە الله عزوجل حەڵاڵی کردبێت، ئەگەر ئەم کارەت کرد درۆت بەسەر الله وە کردووە وە ڕەددی قسەکانی الله ت داوەتەوە، وە گەورەترین زوڵمت کردووە .
الله تعالى فەرموویەتی : قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزۡقٖ فَجَعَلۡتُم مِّنۡهُ حَرَامٗا وَحَلَٰلٗا قُلۡ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمۡۖ أَمۡ عَلَى ٱللَّهِ تَفۡتَرُونَ} [يونس : ٥٩].
لەشوێنێکی تر الله تعالى فەرموویەتی :
{يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ} [المائده : ٨٧]

٣٦٣ -وە یەهودیەکانی بەوە عەیبدار کردووە کە گۆشتی حوشتریان حەرام کردووە کە (الله تعالى) بۆ ئەوان و هەموو مرۆڤەکانی حەڵاڵی کردووە.
الله تعالى فەرموویەتی : كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلّٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُۚ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ [ال عمران : ٩٣]
{فَمَنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ}[آل عمران : ٩٤]

٣٦٤ - دواتر ڕافیضەکان خۆیان شوبهاند بە یەهوودییەکان لە حەرام کردنی ئەو شتانەی کە الله حەڵاڵی کردووە، وە ڕەددی قسەکانی الله عزوجل یان دایەوە، و

گەورەترین بوهتانیان بەسەرەوە کرد، وە مارماسیان حەرام کرد، وە گۆشتی حوشتریان حەرام کرد.

٣٦٥- و رسول الله صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێ : ئەو کەسەی کەحەلال کراوێکی الله حەرامەکات، وەکەو کەسەیە کەحەلالێکی الله حەرامەکات وەزۆر لەوانەی حەرامی دەکەن، وەخواردنی عەیب  دارەکەن : زینا دەکان، وئارەق دەخۆنەوە،  ماڵی خەڵکی بەزولم و ستەم دەبەن  وەهەندێ لەوان ئاسانکاری دەکەن لەحەرام کردنیدا، وە ئەوە بەشتێکی بچوك دادەنێن، لەکاتێکدا عولەماکان تاوان و فاحیشە هەرە گەورەکانیان داناوە، وە دژایەتی کردنی الله یە، وەرەدی قسەی الله داوەتەوە لەوەی کە الله شتێکی حەلال کردوە ئەو حەرامی دەکات، والله فەزڵ و منەت و نیعمەتی خۆیداوە بەسەرماندا، وەك دەفەرمووێ : (وَهُوَ ٱلَّذِی سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُوا۟ مِنۡهُ لَحۡمًا طَرِیًّا [سورەتی النحل 14]

٣٦٦ - فەرموویەتی ﷺ : ئەوەی لە ئاودایە هەمووی پاکە . وە مردووشی حەڵاڵە، و الله خۆی دەزانێت کە مارماسی لە دەریادا دەژیت، وە ئەو چۆن نازانێت و جیایی نەکردۆتەوە کە خۆی دروستی کردووە!
رسول الله ﷺ زانیویەتی کە مارماسی لە دەریادایە.
ئایا ئەمان بیریان چۆتەوە؟ کە مارماسی لەدەریادایە و جیاشیان نەکردۆتەوە و بەگشتی ووتویانە ئەوی لە دەریادا بێ حەڵاڵە؟ !
الله تعالى فەرموویەتی : {وَٱلۡبُدۡنَ جَعَلۡنَـٰهَا لَكُم مِّن شَعَـٰۤىِٕرِ ٱللَّهِ لَكُمۡ فِیهَا خَیۡرࣱۖ}
[الحج : ٣٦]

٣٦٧ - إسرائيل بن يونس رحمه الله دەڵێ : مارماسیەکم برد بۆ زید بن علي رحمه الله، دواتر بەیانی بینیم پێی ووتم : کە ماسیەکەی بەدڵ بووە، وە پێم گەشتووە

کۆمەڵێك حەرامی دەکەن، ئەوانەی حەرامی دەکەن و دەڵێن حەرامە، لەعنەتی اللهیان لێبێ، و لەعنەتی لەعنەت کاران .

٣٦٨ - الحسن بن صالح رحمه الله دەڵێ : بە جعفر بن محمد م ووت رحمه الله : ئەی کوڕی رسول الله ﷺ تۆ ڕات چییە لە مارماسیدا ووتی : ئەوە خواردنێکە حەزم لێیەتی هەر کاتێك بۆم ئامادە بکەن لەدەست خۆمی نادەم

٣٦٩ - أبو أسامة ﴿٢٠١ هـ﴾ رحمه الله دەڵێ : ڕۆژێك الأعمش رحمه الله ووتی : ئەمڕۆ خواردنێکی خۆشم خوارد، شیطان دەزانێ خواردنێکی خۆشە بۆیە حەرامی کردووە لەسەر گەمژەکان.
ووتم: ئەو خواردنە چییە أبا محمد؟
ووتی : مارماسی .

وە لە سوننەتە :

٣٧٠ - ئەو کەسانەی بە رسول الله ﷺ گەیشتوون و باوەڕیان پێی هێناوە ئەوا لە پێش هەموو خەڵکییەوەن، لە ترسان لە الله دا، وە لە گەورەیی و پلە بەرزیدا وە بۆ بینینیشیان شاهێد و دەلیل هەیە . بەو جۆرە ئەهلی ئیمان ئەوانەی کە ڕاستگۆن هەندێکیان پێش هەندێکیان دەخەن لە ئیمان بوون بە الله دا و وە لە عیلم بوون بە الله عزوجل لە دڵەکانیاندا .

وە لە سوننەتە :

٣٧١ - کە بزانی زەواجی موتعە حەرامە هەتا ڕۆژی دوایی.

٣٧٢ - عمر بن الخطاب رضی الله عنه فەرموویەتی : ئەگەر کەسێکم بۆ بهێنن کە زەواجی موتعەی کردووە، وە زانیوێتی کە حەرامە ئەگەر هاوسەردار بێت ئیللا ڕەجمی دەکەم، ئەگەر هاوسەردار نەبێت ئیللا جەڵدی دەکەم .

٣٧٣ - پیاوێکیان هێنا بۆلای ئیمامی عەلی أبن طالب رضی الله عنه کە زەواجی موتعەی کردبوو پێی فەرموو : ئەگەر نەمناسیتایە ئەوا ڕەجمم دەکردی .
ووتم : مەبەستی ئەوەیە کە ئیمامی علی رضی الله عنه ئەوکەسەی ناسیووە زانیوێتی ئەهلی زینا نییە.

٣٧٤ - زەواج دانامەزرێت تەنها بەهەبوونی وەلی ئەمر و دوو شاهێد و داواکار (زاوا).

ووتم : دەبێ وەلی ئەمرەکە ئەهلی سوننە بێت، وە شاهێدەکان ئەهلی سوننە بن، وە زاوا ش ئەوکەسەی داوای ئافرەتەکەی کردووە دەبێ ئەویش ئەهلی سوننە بێت، ئافرەتەکەش ئەهلی سوننە بێت ئەگەرنا عەقدەکە دانامەزرێت.

٣٧٥ - عیددە فەرزێکی الله عزوجل ە دایناوە، وە دەبێ هەموو ئافرەتێکی تەڵاقدراو، وە هەموو ئافرەتێك کە چوونەتە لای وە هەموو ئافرەتێك کە هاوسەرەکەی مردووە جا چوویێتە لای، یان نەچوویێتە لای، وە هیچ کەسێك ئینکاری عیددە ناکات، ئیللا ئەوکەسەی کەسێکی موبتەدیعە و موخالەفەی قسەی الله و رسول ەکەی ﷺ کردووە وە قسەکانیانی ڕەتکردۆتەوە و کافرە بە کتێبی الله عزوجل.

وە لە سوننەتە :

٣٧٦ - شوێنکەوتنی رسول الله ﷺ، وە شوێنکەوتنی هیدایەتەکەی، وە دەستگرتن بە کردارەکانییەوە، وە شوێنکەوتنی کردارەکانی، وە گەڕانەوەی هەموو فەرمانەکان بۆلای ئەو، زۆر گێڕانەوەی سوننەتە باش و جوانەکانی، خۆمان بە سوننەتە جوان و باشەکانی پەروەردە بکەین، و بۆ ئوممەتەکەی ئاشکرا بکەین بۆ ئەوەی ئەوانیش خۆیانی پێ پەروەردە بکەن، بەمەش ئەدەب و پەروەردەیان جوان دەبێ لە دوونیادا، وە لای الله پلەو پایەیان بەرز دەبێتەوە .
وە لەوانەی فەرمانی پێکردووە رسول الله ﷺ، بە صەحیحی لێی گێڕدراوەتەوە .
زیکر کردنی الله عزوجل لە هەمووکاتەکاندا.

٣٧٧ - بسم الله کردن لە دەستپێکردنی خواردندا، وە الحمدالله کردن لە تەواو بوونی خواردندا .

٣٧٨ - وە بسم الله کردن لە سەرەتای دەستنوێژدا .

٣٧٩ - زۆر ئاو لە لوت، دەم وەردان .

٣٨٠ - دوعا کردن لەکاتی شۆردنی ئەندامەکاندا .

ووتم : ئەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە تەنها لە کاتی دەستپێکردنی دەستنوێژدا بسم الله ی کردووە، لە کۆتاییشدا زیکری کردووە، لە کاتی شۆردنی ئەندامەکاندا زیکری دیکەی نەکردووە .

٣٨١ - له شۆردنی ئەندامەکانی جەستەدا، له لەبەرکردنی جلدا، له لەپێکردنی نەعلدا، و له هەموو ئەوانەدا بەڕاست دەستپێدەکەیت، وه بۆ چوونه تەوالێت بەچەپ دەستپێدەکەیت .

٣٨٢ - هەروەها خواردنیش به دەستی ڕاست بێت، خواردنەوەش هەر بەڕاست بێت، واز لەوە بهێنیت کە بەدەستی چەپ بخورێت.

٣٨٣ - تارەت کردن بەدەستی چەپ، واز هێنان لەوەی به دەستی ڕاست بکرێت .

٣٨٤ - ئەگەر کەسێك چووە تەوالێت به قاچی چەپ بچێت، لەکاتی چوونە ژوورەوە بڵێت بسم الله : (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ) .

٣٨٥ - وە کاتێك لێی چووە دەرەوە به قاچی ڕاست بچێتە دەرەوەو بڵێ : (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنِّي الْأَذَى وَعَافَانِي) .

٣٨٦ - وە کار بەو دە شتە بکرێت کە دەڵێن ئەو دە شتە له فیترەت ە، وە سوننەتی باوکمان ئیبراهیم ە علیه الصلاة والسلام، وە پێنجیان لەسەردایە و پێنجیان له لەشدایە .
ئەوانەی کە لەسەردایە : ئاو لەدەم وەردان، ئاو له لوت وەردان، سیواك کردن، سمێڵ کورت کردنەوە، کردنی قژ به دووبەش (داهێنان) .
ئەوانەشی کە له لاشەدان : تارات کردن، خەتەنە کردن، لابردنی مووی پێشەوە و دواوە، کورت کردنەوەی نینۆك (نینۆك کردن)، موو هەڵکێشانی بنباڵ .

وه له سوننه‌ته :

٣٨٧ : كه چوويته مزگه‌وته‌وه قاچی ڕاست پێش بخه‌یت، كه هاتیته ده‌ره‌وه قاچی ڕاست دوابخه‌یت .
له كاتی چوونه ژووره‌وه‌شدا ده‌ڵێیت : اللهم صلی علی محمد النبي وسلم، واغفر لي ذنوبي، وافتح لي أبواب رحمتك .
له كاتی چوونه ده‌ره‌وه‌ش، هه‌مان قسه دووباره ده‌كه‌یته‌وه ته‌نها ئه‌مه زیاد ده‌كه‌یت و ده‌ڵێیت : وافتح لي أبواب فضلك .

وه له سوننه‌ته :

٣٨٨ - به‌ویقار بیت له‌ناو مزگه‌وتدا، هێمن و له‌سه‌رخۆ بیت كاتێك دێیت بۆ نوێژ .

٣٨٩ - پیاو په‌نجه‌كانی نه‌ته‌قێنێت كاتێك ویستی نوێژ بكات.

٣٩٠ - وه ده‌ستی نه‌كات به‌ناو یه‌كدا له نوێژدا .

٣٩١ - وه واز بهێنێت له‌وه‌ی خۆی سه‌رقاڵ بكات له‌ناو نوێژدا .

٣٩٢ - وه واز بهێنێت له‌وه‌ی خۆی سه‌رقاڵ بكات به ئه‌نگوستیله، و ڕیشه‌وه .

٣٩٣ - وه به‌رده‌وام خشوع ی هه‌بێ تێیدا، وه سه‌یری شوێنی سوجده بكات .

٣٩٤ - دەستی ڕاستی دابنێت لەسەر دەستی چەپی، وە لەخوار ناوکییەوە دەست بگرێت، هەر وەك چۆن ئیمامی علي بن أبي الطالب رضی الله عنه ئاوای کردووە، فەرمانی کردووە وابکەین.

٣٩٥ - ئاشکرا کردنی آمین لەدوای قسەی ئیمامەوە کە دەڵێ : ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ وە أمین کە درێژ بکەیتەوە .

٣٩٦ - وە زۆر زیکر کردنی الله عزوجل، وە فێرکردنی عیلم لەناو مزگەوتەکاندا، وە وازهێنان لە قسەو باسی دوونیا لەناو مزگەوتدا، چونکە ئەوانە مەکروهن.
لەو باسەدا کۆمەڵێك حەدیثی باش و چاك گێڕدراوەتەوە بەڕێگەی ڕاست و دروست، بە پیاوانی خاوەن متمانە لەوانە :

٣٩٧ - عبد الله بن مسعود رضی الله عنه گێڕاوێتییەوە لە رسول الله ﷺ کە فەرموویەتی : لە ئاخیری زەماندا قەومانێك دێن لە مزگەوتەکاندا دادەنیشن، ئیمامەکەیان دونیایە، لەگەڵیاندا دامەنیشن، الله هیچ پێویستییەکی بە ئەوان نییە .

٣٩٨ - لەوانە : کە عبدالله بن عمر کە دەڵێ : قیامەت بەرپا نابێت هەتا کۆمەڵە کەسانێك لە مزگەوتەکاندا دادەنیشن، هیچ ئیماندارێکیان تێدا نییە، وە قسەکانیان هەمووی سەبارەت بە دونیایە .

٣٩٩ - الحسن دەڵێ : ڕۆژانێك دێت کە خەڵکی لە مزگەوتەکاندا کۆمەڵ کۆمەڵ دادەنیشن، قسەکانیان سەبارەت بە دونیایە، لەگەڵیان دامەنیشن، لەبەر ئەوەی

الله عزوجل وازی لێهێناون .
ئەمە هەمووی سەبارەت بە قسەکردنی خەڵکیە لەناو مزگەوتەکاندا سەبارەت بە دونیا .

٤٠٠ - وە لە کڕین و فرۆشتن وە لە مووجادەلە کردن، بەربەرەکانێ، وە لەخوێندنەوەی شیعر و هۆنراوە، وە لە بەرزکردنەوەی دەنگ، وە لە دەرهێنانی شمشێر .
وە زۆری ژاوە ژاوە، وە چوونە ژوورەوەی منداڵ، وە ئافرەتان، وە شێتەکان .
وە ئەوانەی لەشگرانن، وە دەنگ بەرز کردنەوە تێیدا بۆ شت فرۆشتن، وە پیشەسازی و بازرگانی کردن .
ئەمانە هەمووی مەکروهن، وە ئەوەی ئەم کارانە دەکات، تاوانبارە، لەبەرئەوەی رسول الله ﷺ نەهی لەم شتانە کردووە، وە توند بووە لەسەری .

ئەو شتانەی رسول الله ﷺ نەهی لێکردووە، وە زۆر توند بووە لەسەر ئەو کەسانەی کە ئەم شتانە دەکەن:

٤٠١ - ئەگەر دوو پیاو لەیەك جلدا بن بێ ئەوەی هیچ بەربەستێك لە نێوانیاندا بێت .

٤٠٢ - وە نەفرەتی کردووە لەو کەسانەی ئەو کارە دەکەن .

٤٠٣ - وە نەهی کردووە لە مکامحە، ئەویش ئەوەیە : دوو پیاو بچنە یەك جلەوە و عەورەتی یەکیان لێ دیاربێت .

٤٠٤ - وە نەهی کراوە لەوەی پیاو عەورەتی دەرخات لە ماڵی خۆیدا، و جگە لە ماڵی خۆی .

٤٠٥ - ئەگەر سەیری عەورەتی کەسێکی تر بکات.

٤٠٦ - ئەگەر پیاو باسی ئەو کاتانە بکات کە تەنهایە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا .

٤٠٧ - وە لەوەی پیاو بە دار لاستیك بەرد بهاوێژێت.

٤٠٨ - وە نەهی کردووە لەوەی سوێند بخورێت بە درۆ .

٤٠٩ - وە ئەگەر خورما بفرۆشرێت بەبێ ئەوەی پێگەشتبێ، زەرد بووبێ یا ڕەش بووبێ .

٤١٠ - لە فرۆشتنی سەگ، و مەیمون، و بەراز .

٤١١ - وە لە یاری تاوڵە، و شەترەنج .

٤١٢ - وە ئەگەر پیاو لەگەڵ ئافرەتێکدا بمێنێتەوە بەبێ ئەوەی مەحرەمێکی لێ بێت .

٤١٣ - ئەگەر پیاو بڵێ : ئێمە لەسەر خێرین هەتا تۆ لەناومان دەمێنیتەوە .

٤١٤ - وە ئەگەر الله ویستی لیَ بێت، تۆ ویستت لیَ بێت.

٤١٥ - وە سوێند خواردن بە غەیری الله تعالی.

ووتم : سوێند خواردن بە غەیری الله تعالی شیرکی بچووکە.

٤١٦ - پیشاندانی چەقۆ بە ئاژەڵەکە لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵەکەدا.

٤١٧ - ئیش پێ کردنی کرێکار بەبێ ئەوەی بزانێ چەندێك پاداشت وەردەگریَ بەئەنجامدانی ئەو کارە.

٤١٨ . ونەهی کردوە لە (النَّجش)

ووتم : النجش : ئەو جۆرە کڕین و فرۆشتنەیە کە لەم سەردەمەدا پێی دەوتریَ زیادکردنی ئاشکرا.

٤١٩ . و خواردنی گۆشت و هێلکە و شیری ئەو ئاژەڵەی کە خواردنی پیسی خواردووە وەك حوشتر و مانگا و مەڕ و بزن و مریشك.

٤٢٠. وە دەڵێن : حوشتر چوار ڕۆژ بەند دەکرێت، وە مانگا سیَ ڕۆژ بەند دەکرێت، وە مەڕ و بزن حەوت ڕۆژ بەند دەکرێت، وە مریشك سیَ ڕۆژ بەند دەکرێت.

ووتم : بەند کردن بە مانای جیاکردنەوەی دێت، بەند دەکرێت بۆ ئەوەی شتی پیس نەخوات، هەریەکەیان لەو ماوەیەی بۆی دانراوە جیا دەکرێتەوە، ئینجا دواتر سەردەبڕێت لە گۆشتەکەی دەخورێت .

٤٢١. وە نەهی کردووە لە کڕین و فرۆشتنی غرر.

وتم : (الغرر) ئەو جۆرە کڕین و فرۆشتنەیە کە کڕیکارەکە نەزان بێت بەرامبەر نرخەکەی، یاخود نەزانێت شتەکە چیە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی بیکڕێت.

٤٢٢. وە فرۆشتنی شتێك کە هی تۆ نییە، و فرۆشتنی شتێك کە لای تۆ نییە .

٤٢٣ . وە لە لێدانی دەموچاوی ئاژەڵ و نیشانەکردنی دەموچاوی.

٤٢٤ . وە تف کردن لە دەموچاوی مرۆڤ.

٤٢٥ . ڕێگری کردنی ئافرەت لە پیاوەکەی کە بێت بۆلای بۆ سەرجێ .

٤٢٦ . پیاو شتێك بلێت و جێبەجێی نەکات، و پەیمان بدات و بیشکێنێت، و باسی نهێنیەکانی براکەی بکات.

٤٢٧ . وە ئیسراف کردن، و کەموکورتی نواندن لە فەرمانەکانی الله تعالى دا.

٤٢٨ . بێ تاقەت بوون بۆ دونیا، وە دڵخۆش بوون بە دونیا.

٤٢٩ . ئەگەر پیاو بە قسەی ژنەکەی بکات (مۆڵەتی بدات) بۆ ڕۆیشتن بۆ وەلیمە، وە مەجلیس و کۆڕی لاواندنەوەی مردوو، بۆ حەمامەکانی دەرەوە، وە ئەگەر پیاو گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی بکات لە هەواو ئارەزووەکانیدا.

٤٣٠ . هەر پیاوێک گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی بکات لە هەموو ئەوشتانەی کە دەیەوێت، لەسەر دەموو چاو فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە .
وە گوێڕایەڵی بکات لەمافی دایک وباوکی دا، وە لەپچڕاندنی پەیوندەی خزمایەتیدا، وە لەیارمەتی دانی براکەی لەپێناو الله دا .

٤٣١ وە فەرمووی ﷺ پێچەوانەی ئافرەتەکان بکەن هیدایەت ئەدرێن، وە بەرەکەتان بەسەردا دەڕژێت

٤٣٢- وە نەهی کردوە لە ئازاردان، و دەسبەرز کردنەوە لێیان .

٤٣٣ . وە فەرمانی کردووە بەپیاو دادپەروەر بێت لەنێوان هاوسەرەکانی، وە بە یەکسانی و دادپەروەری دابەشی بکات لەنێوانیاندا .

٤٣٤ . وە قەدەغەی کردووە ئازاردانی دراوسێ.

٤٣٥. وە لە خۆبەگەورە زانین، وە لە تانەدان لە ڕەچەڵەك، وە زەم كردنی كەسێك لە ڕێگای چرپاندنی بەگوێی كەسێكی تر، وە قسەكردن یان ڕەخنە گرتن لە كەسێك لە ڕێگای چاوداگرتن و بەدەست ئاماژە كردنەوە.

٤٣٦. وە جنێودانی گەورە بەكۆیلەكەی، وە لێدانی.

٤٣٧. فەرمان كراوە بە گەورە كە ئەو خواردنەی خۆی دەیخوات بیدات بەكۆیلەكەی، وە ئەو جلو بەرگەی لەبەر بكات كە خۆی لەبەری دەكات، وە كارێكی پێی نەسپێریت كە لەتوانایدا نەبێت، وە لێی خۆش بێت ئەگەر لە ڕۆژێكدا حەفتا هەڵەش بكات.

٤٣٨. وە قەدەغەی كردووە پیاو دەنووك بدات لە نوێژەكەی وەكو دەنوكی كەڵەشێر (واتە لە كاتی سوجدە بردن بەخێرای سەر دانەوێنێت و بەرزی بكاتەوە).

٤٣٩. وە سوجدە ببات پێش ئەوەی سەری لە ڕكوع بەرزبكاتەوە (واتە لەدوای ڕكوع پشتی بەباشی ڕێك نابێتەوە یەكسەر دەچێتە سوجدە).

٤٤٠. وە دەستەكانی ڕابخات لە كاتی سوجدە بردندا وەكو چۆن سەگ دەستی ڕادەخات.

٤٤١. وە ئەگەر وەك دانیشتنی مەیمون دابنیشێت (لە نێوانی سوجدەكان وە لە كاتی تەحیات دا).

٤٤٢ . وه سەری بەرز بكاتەوه ودايبنێتەوه پێش ئيمام (واته له كاتی نوێژدا پێش ئيمامەكه بكەوێت) ياخود لەو كاتەدا لەگەل ئيمامەكەدا بێت.

٤٤٣ . وه پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی : ئايا ئەو كەسەی سەری لەپێش ئيمامەوه بەرز دەكاتەوه ناترسێت لەوەی الله سەری بگۆڕێت بۆ گوێدرێژ.

٤٤٤ . وه پێغەمبەر فەرموويەتی ﷺ : هەر كەسێك پێش ئيمام سەری بەرز بكاتەوه يان دايبنێتەوه، ئەوا نوێژی بۆ نييه .

٤٤٥ . ڕێگری كردووه له كاتی نوێژكردن دەست لەسەر كەمەر دابنێيت .

٤٤٦ . وه ڕێگری كردووه بەناو لەپی دەستی ڕاست ناو لەپی قاچەكان بشۆی جار لەدوای جار.

| ووتم : واته ڕێگری كردووه كه به دەستی ڕاست له كاتی دەستنوێژ شوشتن قاچەكانت بشۆی. |
|---|

٤٤٧ . وه ڕێگری كردووه لەباوێشك دان، وه فوو كردن لەنوێژدا.

٤٤٨ . وه پاكردنەوەی شوێنی سوجده لەنوێژدا.

٤٤٩ . پاكردنەوەی ئەو خۆڵەی بەدەموچاویەوە هەیە پێش ئەوەی سلام بداتەوە.

٤٥٠ . وە ئەگەر سەیری ئاسمان بكات لەنوێژدا.

٤٥١ . وە چاوی دابخات لە سوجدەدا.

٤٥٢ . وە خوێندنی قورئان لە ڕكوع و سوجدەدا.

٤٥٣ . وە كۆكردنەوەی قژ، یان جل لە كاتی نوێژدا.

٤٥٤ . بەردانەوەی جل و پۆشاک.

٤٥٥ . واشتِمَالِ الصَّمَّاءِ (ڕێگری كردووە لەو جۆرە جلەی كە مرۆڤ لەخۆی دەپێچێت وە هیچ شوێنێكی تێدا نییە قۆڵی لێ دەربهێنێت).

٤٥٦ -وە ئەگەر پیاو نوێژ بكات لەجلێكی دیاردا (وەك جسداشه)، وە نەی بەستبێ، وەهیچ جلێكیشی لەژێرەوە لەبەرا نەبێت .

| ووتم : ئەگەر جلێكی لەژێرەوە لەبەرابێت عەورەتی دا پۆشێت كێشەی نیە . |
|---|

٤٥٧ . وە نوێژ بکات بەجلوبەرگی تەسکەوە کە هیچ جلێکی تری لە ژێرەوە لەبەر نەبێت.

٤٥٨ . ڕیزەکان ببڕێت لە کاتی نوێژ کردندا (یاخود لە کاتی نوێژی هەینی دا ڕیزی دانیشتنەکان ببڕێت).

٤٥٩ . وە پیاو نوێژ بکات لەڕیزی دووەم وە ریزی یەکەم بەتاڵ بێت.

٤٦٠ . وە پیاو پشت ببەستێت بەدیوار لە کاتی نوێژ کردندا .

٤٦١ . وە پیاو نوێژ بکات لەسەر دیوار.

٤٦٢ . وە پیاو نوێژ بکات لە حەمامدا ، وە لە گەوڕی حوشتردا، وە لەسەر ڕێگا، لەناو گۆڕستاندا، لەناو شوێنی سەربڕینی ئاژەڵدا، لەناو حاویەدا ، وە لەسەر کەعبە.

٤٦٣ . وە پیاو لەنوێژەکەی تەواو بێت وە گومانی لە نوێژەکەی هەبێت.

٤٦٤ . وە رسول الله ﷺ لەعنەتی کردووە لەوەی تاتۆ دەکات وە لەوەیش بۆی دەکات، وە لەبەستنی قژ بە قژەوە و لەوەیش بۆی دەکات، وە ئەوەی برۆ دەکات وە لەوەیش بۆی دەکات، وە لەددان شاش کردن، ئەوەی ددان شاش دەکات وە لەوە کەسەش ددان بۆ کەسێکی تر شاش دەکات.

٤٦٥ . وە فەرموویەتی ﷺ : هەر ئافرەتێك جلوبەرگەكەی دابكەنێت لەدەرەوەی ماڵی پیاوەكەی یاخود لەدەرەوەی ماڵەكەی خۆی، ئەوا هەتكی ئەو داپۆشینەی كردووە كە لەنێوان خۆی و الله دابووە .
وە لەو ئەدەبەی پێغەمبەر ﷺ فێری ئوممەتەكەی كردووە وە لەو پەروەردەیەی داویەتی لە ڕەوشتی بەرز وە لە كرداری جواندا .

٤٦٦ . ڕێگری كردووە ﷺ لەوەی پیاو لەبەردەمی براكەیەوە نان بخوات، خواردنی بەردەم براكەی بخوات.

٤٦٧ . فەرمانی كردووە كە خواردن لە لێواری قاپەوە بخورێت، وە فەرموویەتی : بەرەكەت دادەبەزێتە ناوەراستی خواردنەكەوە) .

٤٦٨ . وە فەرمانی كردووە بە شۆردنی دەست لە پێش خواردنەوە وە لە دوای خواردنەوە
فەرموویەتی : (ئەوە فەقیری ناهێڵێت).

ووتم : ئەمە جێگای خیلاف بووە لەلای سەلەف، هەندێكیان پێیان خۆش بووە لە پێش و پاش خواردن دەست بشۆرێت، وە هەندێكیان پێیان خوش نەبووە.

٤٦٩ . وە فەرموویەتی ﷺ : هەر قەومێك لە پێش و پاش خواردنەوە بەردەوام دەستنوێژ بشۆن ئەوا الله تعالى بەهۆیەوە فەقیریان لەسەر لادەبات.

٤٧٠ . وە فەرمانی كردووە پیاو ئەو خواردنە بخوات كە لە قاپەكەی دەكەوێتە خوارەوە، وە فەرموویەتی : هەر كەسێك لەو خواردنە بخوات كە لەقاپەكەی

دەکەوێتە خوارەوە ئەوا لە فەقیری بەدوور دەبێت، وە منداڵەکانیشی لە گێلی بەدوور دەبن.

٤٧١ . وە ڕێگری کردووە لەوەی پیاو بخەوێت وە دەستەکانی پاشماوەی گۆشتی پێوە بێت.

٤٧٢ . وە نان بخوات و بخەوێت وە ئەو لە لەشگرانیدا بێت.

٤٧٣ . وە رسول الله ﷺ حەزی دەکرد ئەگەر کەسێك لەشگران بێت بیەوێ نان بخوات، یان بخەوێت دەستنوێژ بگرێ وەك دەستنوێژ گرتنی نوێژ.

٤٧٤ . وە ڕێگری کردووە ﷺ لە خواردنی خورما دوو دوو پێکەوە، ئەگەر کەسێك ئەم کارە بکات ئەوا ئادابێکی ناشیرینی کردووە لەخواردندا.

٤٧٥ . وە پیاو سەیری دەمی براکەی بکات کاتێك نان دەخوات.

٤٧٦ . وە رسول الله ﷺ حەزی لەخواردنی (الثرید) بوو، وە دەیفەرموو : بەرەکەت دادەبەزێتە ناو ئەم خواردنەوە.

ووتم : ثرید، خواردنێکە نان و گۆشت و کولەکە وە کۆمەلێك سەوزەی تێدەکرێت.

٤٧٧ . وە ڕێگری کردووە لەوەی بە گەرمی بخورێت.

٤٧٨ . وە نەهی کردووە ﷺ لە خواردنەوە لە کوندە دا ، وە لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی دەیخواتەوە نازانێت چی تێدایە.
وە دەڵێن : پیاوێك ئاوی لە کوندە دا خواردووەتەوە (شتێکە لە چەرم وپێستی ئاژەڵ دروست دەکرێت وە کونەیشی پێ دەوترێت)، وە لەناویدا ماری تێدابووە، نەیزانی بوو تاوەکو چووتە قورگیەوە.
وە هەروەها دەڵێن : بۆنی دەمی ئەو کەسەش ناخۆش دەکات کە تێدا دەیخواتەوە.

٤٧٩ . وە نەهی کردووە ﷺ لەوەی پیاو شەو بمێنێتەوە لەسەر ڕێگاکان بۆ ئیسراحەت کردن ئەویش لەبەر ئەوەی ڕێگاکان شوێنی هاتووچۆی خەڵك و حەیوانانت و جنۆکەیە . وە ئەمەش دەبێتە هۆی بارگرانی بۆیان، پاشان کەسی خەوتوو نازانێ کە چی ڕوودەدات لە دەوروبەری.

٤٨٠ . وە نەهی کردووە ﷺ لەوەی پیسای بکرێت لەسەر ڕێگا، فەرموویەتی : مەلعونەکان بترسن .
ووتیان : مەلعونەکان کێن؟
فەرمووی : ئەوانەی لەسەر ڕێگاکان پیسای دەکەن.
وە دەڵێ : ئەگەر پیسیەکان لەسەر ڕێگاکان زۆربوون ئەوا ڕێگاکان بەپیسی دەگیرێت.

٤٨١. وه نەهی کردووه پیاو لەژێر درەختی بەرهەمدار، پیسایی بکات ئەوەش لەبەر ئەوەیە لەوانەیە بەرهەمەکە بەربێتەوە سەر پیسایەکە، یان بکەوێتە نزیکەوە، بەمەش تووشی خەساری بکات.

٤٨٢. وه نەهی کردووه لەوەی جیماع بکرێت لەژێر درەختێکی بەرهەمداردا.

٤٨٣. لەوەش دوو کەس پیسایی دەکەن و پێکەوە قسە بکەن، وه پیاو قسەبکات کە لە ئاودەست بێت.

٤٨٤. وه قسە بکات لەکاتی جیماع کردن، یان سەیری دامێنی ژنەکەی بکات لە کاتێك جیماعی لەگەل دەکات، یان ژنەکە سەیری دامێنی پیاوەکە بکات لەکاتی جیماع کردندا.

ووتم : حدیثێك هەیە دەربارەی ئەوەی نابێت هاوسەرەکان لەکاتی جیماع کردندا سەیری دامێنی یەکتر بکەن لەبەر ئەوەی کوێری دەهێنێت، بەڵام حدیثەکە صەحیح نییە، وه حدیثی صەحیح هەیە کە رسول الله ﷺ لەگەڵ دایکمان عائیشە لەیەك سەتڵدا خۆیان شۆردووە، ئەگەر ئەمە بەمجۆرە بێت کە تا ئێستا هیچ بەڵگەیەی صەحیحمان لەسەری نەبینیووە جگە لەوەی ابن بطە لێرەدا هێناویەتی، ئەوا تەنیا لەکاتی جیماع کردندا، نابێت سەیر بکرێت.

٤٨٥. یان هەردووکیان بەیەك شت دامێنیان پاك بکەنەوە.

٤٨٦. وه نەهی کردووه ﷺ کە پیاو لەبەر پیاو هەستێت، ئیللا پیاو لەبەر باوکی هەستێت، یان لەبەر زانایەك، یان لەبەر ئیمامێکی دادپەروەر.

٤٨٧ . وە نەهی کردووە پیاو حەز بکات لەبەری هەستن، وە فەرموویەتی : هەر کەسێك حەز بکات خەڵکی لەبەری هەستن، ئەوا با شوێنك بۆخۆی دابنێت لەناو ئاگردا.

٤٨٨ - وە فەرموویەتی : هەر کەسێك هەستایەوە بۆ ئەوەی خەڵکی بە هەستانەوەکەی هەستنەوە، اللَّه سەیری ناکات.

٤٨٩ . وە فەرموویەتی ﷺ : هەر کەسێك هاوەڵانی دوونیا پایەدار بکات، وەك ئەوە واییە بتی پایەدار کردبێت.

٤٩٠ . وە فەرموویەتی ﷺ : هەر کەسێك هاورێیەتی ئەوانە بکات کە دونیا ویستن وە نەرم بێت لەگەڵیان، ئەوا داهێنراوێکی داهێناوە.

٤٩١ - وە فەرموویەتی ﷺ : هەر کەسێك بچێت بۆ لای دوونیا ویستەکان وە خۆی لەبەریان بچەمێنێتەوە، ئەوا سێ بەشی دینەکەی ڕۆیشتووە.

### وە لە ئادابەکانی ﷺ:

٤٩٢ - نەهی کردووە لەوەی پیاو فوو بکات لەخواردنەکەی، یان خواردنەوەکەی.

٤٩٣. وه فەرموويەتی ﷺ : هەر كەسێك پارویەك لە دەستی كەوتە خوارەوە با هەڵیبگرێتەوە، وە بیخوات، یان بیدات بە كەسێك كە بیخوات، با وازی لێنەهێنێت بۆ شەیتان.

٤٩٤. وە ﷺ : خورمای دەخوارد يطفو ی دەكرد
واتە : خورماكەی لە ناوەراستی دەستی دادەنا وە دەیخوارد، ناوكەكەشی بەسەری پەنجەی هەڵدەگرت.
وە ئەم ئادابانە وە هاوشێوەكانی ئەوانەی كە لێرە نەمنوسیوون بۆ ئەوەی بابی ئەم كتێبە درێژ نەبێتەوە لە ئاداب وە ئەمر و نەهیەكانی،
واجبە لەسەر هەمووان كار بەمانە بكەن، وە بەدوایدا بگەڕێن وە شوێنی بكەون، وە گوێرایەڵی بكەن وە دەست بگرن بەسونەتەكەیەوە یاخود سونەتەكەی وەربگرن لەبەر ئەوی عەقلێكی تێگەیشتوو دەزانێ ئەم شتانە تەواون وە نەفسێكی ئاقل و تێگەیشتوو بەرەو ئەم شتانە دەروات.
وە ئەمانە هەمووی ئەدەب وپاك و خاوێنین، وە خۆ بەدوورگرتن لە شتە خراپەكان
وە ئێمە لێرەدا لەوانەمان گێرایەوە كە خەڵكی پێویستە لەسەریان بیزانن وە پێویستە لەسەریان كاری پێ بكەن وە زۆر پێویستیان پێیەتی، عوزر بۆ هیچ كەسێك نیە لەمەدا كە نەیانزانێت، وە عورز بۆ هیچ كەسێك نییە كەمو وكورتی بكات لەفێربوونیدا.

وە ئێمە ئیستا پێچەوانەی ئەوانە باس دەکەین:
لەو بیدعانەی خەڵکی دایانهێناوە هیچ بنچینەیەکێ نییە لەکتێبی اللە دا، وە لە هیچ ئەثرێك لەبارەی ئەمانە نەهاتووە، ئەگەر ئەمانە ئەنجام بدەیت، بەهۆیەوە هیچ لەدین نزیك نابیتەوە، ئەمانە شتی گەورەن وە اللە رێگەی پێ نەداون.

لەوانەش:

ئەوانەی رسول اللَّه ﷺ حەرامی کردووە و زۆر لەسەریان توند بووە :

٤٩٥ . لەخۆدان و شیوەن کردن، وە گوێی گرتن لێی، وە فەرموویەتی : لەخۆدان و شیوەن کردن لەکاری جاهیلیەتە .

٤٩٦ . وە فەرموویەتی : پەیداکردنی پارە بە شیوەن و لەخۆدان وە لاواندنەوە وەك وەرگرتنی بەرتیل وایە.

٤٩٧ . لە شوێنی تر لەعنەتی کردووە لەوانەی شیوەن و لاوانەوە و لەخۆدان دەکەن.

٤٩٨ . وە ابن عمر رضي اللّه عنهما دەڵێ : شیوەن و لەخۆدان حەرامە، وە گوێ گرتن لێی بیدعەیە.

٤٩٩ . وە إبراهیم دەڵێ : بەدەستهێنانی پارە بە گۆرانی و شیوەن و لەخۆدان وە لاواندنەوە وەك بەرتیل وەرگرتن وایە.

٥٠٠ . عمر بن خطاب رضي الله عنه، جارێك له ئافرەتێك دەدات كه شيوەن و لاواندنەوە دەكات بۆ مردوو، لێی دەدات تاوەكو قژی دەردەكەوێت، پێی دەڵێن : ئەی ئەميری باوەرداران قژی دەركەوت!
فەرمووی : اللّٰه دووری بخاتەوە، ئەمە هيچ ڕێزێكی نييە . پێی ووترا بۆچی؟
فەرمووووی : لەبەر ئەوەی فەرمان دەكات كه ئارام نەگيرێت، كه اللَّه ڕێگری لەوە كردووە، وە نەهی دەكات لەوەی ئارام بگرێت، كه اللَّه فەرمانی پێی كردووە، پارە وەردەگرێت بەو فرمێسكانەی دەيرێژێت، وە دەگری لەسەر تەرمێك كەهی ئەو نييە، وە زيندووەكان بێتاقەت دەكات، وە ئازاری مردووەكەش دەدات.

٥٠١ . وە ابن عون رضي اللّه عنه دەڵێ : ڕۆيشتم بۆ كوفه لەسەر ڕێگاكه پياوێكم بينی كه شيوەن و لاواندنەوەی دەكرد پرسيارم لێكرد دەربارەی ئەوە؟ !
پێی ووتم : شيوەن و لاواندنەوە دەكەين بۆ حسين رضي اللّٰه عنه . ڕۆيشتم بۆلای إبراهيم و ئەمەم پێی ڕاگەياند، ئەويش ووتی : هەتا ئێستا خەڵكی كوفه هەر ساڵێك بيدعەيەك دادەهێنن، هەتا وايان لێ دێت حەق لەناويان دەبێتە بيدعه.

وە لەبيدعه :

٥٠٢ . گوێ گرتن له كۆيله گۆرانی بێژەكان، بۆ گوێ گرتن له گۆرانی.

٥٠٣ . إبن مسعود رضي اللَّه عنه دەڵێ : گۆرانی نيفاق دەچێنێت لەدڵدا وە گەشەی پێدەدا، وەك چۆن ئاو گەشه به سەوزە دەدات .

وه لەبیدعه:

٥٠٤ . ئەستێرە ناسی، وە فێربوون وە سەیرکردنی ئەستێرە ناسی وە دەستگرتن پێیەوە . بەڵکو ئەوە بەشێکە لە شیرك، وە بانگەشە کردنی زانینی علمی غەیبە لەلایەن ئەو کەسەوە.

هەموو هاوشێوەکانی حەرام کراوە، وەکو : ئەستێرە ناسی، وە بانگەشە کردن بۆ زانینی علمی غەیب، وە بڕیاردان لەسەر ڕووداوەکان بە ئاژەڵەکان بەشوێن پێی هەلگرتنی باڵندە وە بەدەنگی وە بە فڕینی بەئاڕاستەکاندا.

ووتم : مەبەست پێی ئەو ئەستێرە ناسیەیە کە ڕووداوەکانی سەر زەوی دەبەستنەوە بە جوڵە وکات وە شوێنی ئەستێرەکانەوە، لەسەردەمی جاهیلیدا باڵندەیان هەڵدەدا بە ئاسماندا ئەگەر بەلای ڕاست بفڕیبایە ئەوا سەفریان دەکرد، وە ئەگەر بەلای چەپدا بفڕیبایە ئەوا سەفریان نەدەکرد پێیان وابوو لەو سەفریان شتی خراپ ڕوودەدات، دەنگی باڵندەکانیش هەندێك پێیان وایە کە خوێندنی هەندێك باڵندە لەهەندێك کاتی دیارینەکراو ئەوا شتی خراپ دەهێنێت وە پێیان وایە خوێندنی هەندێك باڵندە لەسەر ماڵ شتی خراپ دێنێت.

٥٠٥ . فەرموویەتی ﷺ : هەرکەسێك بچێت بۆلای کاهینێك، یان کەسێك بانگەشەی علمی غەیب دەکات باوەری پێی بهێنێت ئەوا کافربووە بەوەی بۆسەر دڵی محمد ﷺ دابەزیووە.

٥٠٦ . وە فەرموویەتی ﷺ : هەرکەسێك فێری بەشێك لەزانستی ئەستێرە ناسی ببێت، ئەوا فێری بەشێك لەشیرك بووە، وە تا زیادی بکات ئەویش زیاد دەبێت.

٥٠٧ . وە علي بن أبي طالب رضي اللَّه عنه فەرموویەتی : ئاگادارتان دەکەمەوە لە زانستی ئەستێرە ناسی، ئیللا ئەوە نەبێت لەتاریکیەکانی شەودا هاتووچۆی پێ

بکەن لە وشکانی و دەریا، (لەکۆندا بەمە ڕێگاکانیان دۆزیووەتەوە بەتایبەتی لەبیاباندا کە هەندێك قورس ڕێگاکان دەدۆزرێتەوە)، چونکە بێگومان ئەستێرە ناسی وەك سیحر وایە، وەسیحریش کاهینیەتە، وە کاهینەتیش کوفرە، کوفریش لەناو ئاگرە.

وە لەبیدعە :

٥٠٨ . ئەگەر پیاو سەرو ڕیشی بە ڕەنگی ڕەش ڕەنگ بکات.

٥٠٩ . یاخود لە درێژی ڕیشی بگرێت.

ووتم : ئیللا ئەوە نەبێت کە لە ابن عمر رضي اللّٰه عنه گێردراوەتەوە، کە لە حەج و عومرەدا بەمشتی ڕیشی گرتووە چەندێك لەوە زیاد بوبێت بڕیویەتی، زۆری تریش لە سلف لەوەدا لاساییان کردۆتەوە، بەڵام جگە لەوە نابێت لێی بگیرێت، وە کورت بکرێتەوە.

٥١٠ . یان سمێڵی درێژ بکاتەوە.

٥١١ . وە دەڵێن : یەکەم کەس کە قژ و ڕیشی ڕەش کردووە فیرعون بووە.

٥١٢ . وە دەڵێن : ئەوە ڕەنگ کردنی ئەهلی ئاگرە.

٥١٣ . وە فەرمانی کردووە ﷺ بە هێشتنەوەی ڕیش وە کورت کردنەوەی سمێڵ.

وه لەبیدعە :

٥١٤ . پیاو بۆنی زەعفەران لە خۆی بدات، یان دەستی لەخەنە بگرێت.

وه لەبیدعە :

٥١٥ . پیاو جلەکەی درێژ بکاتەوە تاوەکو دەچێتە خوار قولە پێیەوە.

٥١٦ . رسول الله ﷺ فەرموویەتی : الله عزوجل سەیری کەسێك ناکات کە جلەکەی لە خوار قولە پێیەوە بێت.

وه لەبیدعە :

٥١٧ . سەیری ئەو کتێبانە بکرێت کە نوشتەی تێیدا، وە قسە لەگەل جنەکان بکرێت، وە بەکاریانبهێنی، وە یەکیان پێ بکوژی .

وه لەبیدعە :

٥١٨ . هەڵواسینی دوعا بەبێ ئەوەی پێویستیت پێی بێت، یان ئەوەی هەڵی دەواسێت تووشی شتێك بووبێت.

| ووتم : هەندێك لەسەلەف رێگەیان بەوە داوە دوعا هەڵبواسرێت بە کەسێکەوە کە تووشی ڕووداوێك بووە. |
|---|

وه لەبیدعه :

٥١٩ . ئافرەتەکان شوێن جەنازە بکەون.

٥٢٠ . لەخۆدان تێیدا، دیاری کردنی شوێنی پیاوەکان بۆ ئەوەی هەندێکیان دوای بکەون وە هەندێکیان پێش جەنازەکە بکەون بەخێرای.

وه له بیدعه:

٥٢١ . هاوار کردن، وه لەخۆدان، وه جلوبەرگ دڕاندن له کاتی گوێی لێ بوونی قورئان، ئەمه ئەوانەیه که داهێنراوه، وه خەلکی بیدعەیان تێیدا کردووه.

٥٢٢ . وه أنس بن مالك رضى الله عنه دەلێ : رسول الله ﷺ وتارێکی بۆداین، به وتارەکه دڵەکانمان پێی ترسان، وه چاوەکانمان فرمێسکیان ڕشت، کەسێك هاواری کرد لەسوچێکی مزگەوتەکەوه .
رسول الله ﷺ : فەرمووی ئەوه کێیه دەیەوێت دینەکەی خۆمانمان پێی بفرۆشێتەوه؟! ئەگەر راستگۆ بێت ئەوا خۆی ئاشکرا کردووه، وه ئەگەر درۆیش بکات ئەوا الله بەهیلاکی ببات.

٥٢٣ . الفضيل بن عياض رحمه الله دەڵێ : موسى بن عمران عليه الصلاة والسلام وتارێکی بۆ قەومەکەیدا، پیاوێك لەوێ ئامادە بوو جلەکەی لەبەری خۆیدا دڕاند، الله تبارك وتعالى وەحی بۆ موسى عليه الصلاة والسلام نارد پێی فەرموو ئەگەر ئەو پیاوه راستگۆیه با دڵی خۆیم بۆ شەق بکات.

٥٢٤ . وە ابن مبارك رحمه الله دەڵێ : ئەو کەسانەی لە کاتی گوێ گرتن لە قورئان دەبورێنەوە لەسەر دیوارێکی بەرز دایان دەنیشێنین، وە بەسەریان دەخوێنین، ئینجا سەیریان دەکەین بزانین ئایا لەسەر ئەوەش دەبورێنەوە.

٥٢٥ . وە کۆمەڵێك لە خەڵکی : ژیانێکی سادە و دونیا نەویستی دەردەخەن، وە کۆبوونەوە بۆ گوێ گرتن لە شیعرەکان وە کۆبوونەوەیان لەسەر ئەوە بە سوننە دەزانن بۆخۆیان، بەوە نەفس و گوێ گرتنیان سەرقاڵ دەکەن، وە دڵەکانیان ئاسودە دەکەن، وە تێیاندا هەیە سەما دەکات، وە تێیاندا هەیە چەپڵە بەدەستەکانی لێ دەدات، وە تێیاندا هەیە جلەکانی دەسوتێنێت، وە لە قسەکانیان دەڵێن : الله تعالی دەڵێ، وە حۆریەکان دەڵێن وە وەلی دەلێت. شتانێك دەڵێن الله عزوجل نەیفەرمووە، وە هیچ ئەثرێکی لەسەر نەهاتووە و لەسوننەتیش هیچ شتێك لەوانەی تێیدا نییە، وە حۆریەکان هیچیان وایان نەوتووە وە وەلیش وای نەوتووە، ئەوانە موبتەدیع و درۆزن و بوهتان چین.

٥٢٦ . وە کۆمەڵێکی تر لە خەڵکی : وای دەردەخەن کە ئەوان زاهید و عیبادەتکارن، وە کەسابەت و بژێوی پەیدا کردن حەرام دەکەن، وە ئەوان وای دەبینن مقامات و الكديه هەبێت، ئەوان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە الله یان خۆشدەوێ بە پەکخستنی ترس و ئومێد، (واتە ئەوان بانگەشەی ئەوە دەکەن تەنها دینداری بە خۆشەویستنی الله دەکەن وە بە ترس و ئومێدی ناکەن)، وە ئەوانە هەمووی بیدعەن، و ئەهلی عیلم و زانین زۆر ڕقیان لەو کەسانە بووە کە ئەم کارە دەکەن و بانگەشەی بۆ دەکەن، لەبەر ئەوەی الله عزوجل کەسابەتی حەلال کردووە، وە پیشەسازی حەلال کردووە، وە بازرگانی حەلال کردووە لەسەر حوکمی قورئان وسوننەت هەتا ڕۆژی قیامەت، وە حەڕامی کردووە مقامات وگۆرانی و الكديه.

٥٢٧ . وه زانایان کۆبونەتەوە هیچ خیلافێك لەنێوانیان نییە : لەسەر ئەوەی الله عزوجل واجبی کردووە لەسەر دروستکراوەکانی کە لێی بترسن و ئومێدشیان پێی هەبێ، وە بەندەکانی بەرەو ئەوە بانگ کردووە کە ئومێدیان پێی هەبێ وە لێی بترسن.

وە لەو بیدعە داهێنراوانەی کە هیچ بنەرەتێکی نییە لە قورئان و سوننەتدا، کە ئەم بیدعانە شوبهێنراون بەکاری سەردەمی جاهیلیەت.

٥٢٨ . ئەویش کۆمەڵ کۆمەڵێنەیە، هەر کەسێك پشتیوان و سەرخەری کۆمەلەی خۆی بێت . ئەمە بیدعەیەکی مەکروهە، لەسەردەمی جاهیلیەت ئەم شتە دەکرا، اللَّه عزوجل ئەمەی لابرد بە ئیسلام، وە نەهی لێکرد لەسەر زمان پێغەمبەرەکەی ﷺ.

٥٢٩ - وە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : تاقم تاقمێنی نییە لەئیسلامدا، بەڵکو ئەمە کاری سەردەمی جاهیلی بووە، ئیسلام هات بە دڵنیاکردنەوەی دژی ئەمە.

٥٣٠ . وە شەهادەت بیدعەیە، وە بەرائەت بیدعەیە، وە الولایەت بیدعەیە.

الشهادة : ئەوەیە کە شایەتی بۆ کەسێك بدەی کە بەهەشتیە یان دۆزەخیە کە هیچ دەقێکی قورئان یان فەرموودەی لەسەر نەهاتبێت.

الولاية : پشتگیری قەومێك بکەی، و بەریئ بیت لەوانی تر.

البراءة : بەریئ بیت لە قەومێك کە لەسەر دینی ئیسلام وسوننەت بن.

له بیدعه‌یه:

٥٣١ . ئه‌گه‌ر سوڵتان پیاوێك ده‌ستگیر بكات لێی بدات، وه ئازاری بدات، پێی بڵێ : تۆ ئه‌وهات نه‌كردووه؟ تۆ ئه‌م كاره‌ت نه‌كردووه؟ هه‌تا دانیپێدا ده‌نێت.

وه له بیدعه :

٥٣٢ . التغبير له‌ناو مزگه‌وته‌كاندا.

ووتم : التغبير ئه‌وه‌یه كه جۆره ئامێرێك لێ ده‌درێت و شیعر ده‌خوێنرێته‌وه وه سه‌ما ده‌كرێت.

٥٣٣ . وه ئه‌گه‌ر ئافره‌تان سواری السروج بن.

ووتم : السروج جۆره كورتانێكه كه تایبه‌ت بووه به پیاوان وه سلف ڕقیان لێ بووه ئافره‌تان سواری كورتانی پیاوان بن وه پیاوان سواری ئه‌و كورتانانه بن كه تایبه‌ته به ئافره‌تان.

٥٣٤ . وه ئه‌گه‌ر پیاو سواری السروج النمور بێت.

٥٣٥ . وه په‌رداخ و قاپ و قاچه‌خه‌كه‌ت له زێر و زیو بێت، وه جلی حه‌ریر و یان جلێك كه حه‌ریری تێدا به‌كارهاتبێت له‌به‌ری بكه‌یت.

وه له بیدعه:

٥٣٦ . بینا كردن له‌سه‌ر قه‌بره‌كان، وه به‌رزكردنه‌وه‌ی قه‌بره‌كان.

٥٣٧ . وه‌ گه‌شت كردن بۆ لای قه‌بر.

وه‌ له‌ بیدعه‌ :

٥٣٨ . گه‌وره‌كردنی مردن ( گه‌وره‌ ڕاگرتنی مردن) ، دراندنی جله‌كان، وه‌ ڕه‌ش كردنی ده‌رگاكان، وه‌ دانانی كه‌سێك بۆ پێهه‌ڵدانی مردووه‌كه‌ به‌ شیعر، وه‌ دانیشتن له‌به‌ر ده‌رگای ماڵی مردووه‌كه‌ دوای شاردنه‌وه‌ی، وه‌ پێدانی نان به‌و كه‌سانه‌ی دێن بۆ ماڵی مردووه‌كه‌، وه‌ كۆبونه‌وه‌ی خه‌ڵكی له‌ ماڵی مردووه‌كه‌ .

وه‌ له‌ بیدعه‌ :

٥٣٩ . خوێندنه‌وه‌ی قورئان به‌ ئاوازه‌وه‌، وه‌ شوبهاندنی به‌ گۆرانی.

وه‌ له‌ بیدعه‌:

٥٤٠ . ڕازاندنه‌وه‌ی موصحه‌فه‌كان.

٥٤١ . جوان كردنی مزگه‌وته‌كان.

٥٤٢ . وه‌ درێژ كردنه‌وه‌ی مینبه‌ره‌كان.

وه‌ له‌ بیدعه‌:

٥٤٣ . وه‌رگرتنی پاداشت له‌ سه‌ر بانگدان، وه‌ له‌سه‌ر ئیمامه‌ت كردن، وه‌ له‌سه‌ر فێركردنی قورئان، وه‌ له‌سه‌ر شۆردنی مردوو.

وه له سوننەت و تەواویەتی ئیمان:

٥٤٤ . بەرائەت بکەی له هەر ناوێك که پێچەوانەی سوننەیە، وه دەرچووه له کۆدەنگی ئوممەت، وه حاڵیان ڕوون بکەی بۆ خەڵك، وه دوور بکەویتەوه له هەر کەسێك که ئەوه بیروباوەڕی بێت، وه له اللَّه عزوجل نزیك بیتەوه به پێچەوانەکردنیان، وه نموونەی ئەمانه وەکو:
الرَّافضةُ، والشِّيعةُ، والجهميَّةُ، والمُرجئةُ، والحَرُوريَّةُ، والمُعتزلةُ، والزَّيديَّةُ، والإماميَّةُ، والمُغيريَّةُ، والإباضِيَّةُ، والكَيسانيَّةُ، والصُّفرِيَّةُ، والشُّرَاةُ، والقدريَّةُ، والمَنانيَّةُ، والأزارِقَةُ، والحلولِيَّةُ، والمنصورِيَّةُ، والواقِفَةُ، ومَن دفعَ الصِّفاتِ والرُّوايةَ.
وه له قسەی هەموو موبتەدیعێك، وه له هەموو رائیەکی دەرچوو، وه له هەموو ئەهوایەکی شوێن کەوتوو.
وه هەموو ئەوانه و هەموو ئەوانەی که هاوشێوەی ئەمانەن، وه ئەوەی که لێی جیابووتەوه، وه ئەوەی که لێیەوه نزیکه، وتانێکی هەڵگەڕاوەن، وه مەزهەبانێکی خراپن، خەڵکەکانی له دین دەخاته دەرەوه وه لەبیروباوەڕ و قسەی موسلمانان

٥٤٥ . وه بۆ ئەم قسه و مەزهەبانه کۆمەڵه سەرانێك هەیه که سەرکردەی گومراین، له پێش هەموو کەسێکن بۆ کوفر کردن و قسەی خراپ، وه شتانێك دەڵێن لەسەر الله که نایزانن، وه ئەهلی حەق عەیبدار دەکەن به ئەوانەی دەیانهێنن، وه پیاوانی خاوەن متمانه تۆمەتبار دەکەن، بەڵام ڕەئی و لێکدانەوەی خۆیان تۆمەتبار ناکەن.
بیدعەیان بڵاوکردەوه، وه بازاری فیتنەیان کردەوه، وه دەرگای بەڵایان کردەوه .
بوختان دەکەن لەسەر اللَّه، وه قسه دەکەن له کتێبی الله بەدرۆ ودوژمنایەتی .
برای شەیتانن، وه دوژمنی ئیماندارنن، سەرچاوەن بۆ موبتەدیعەکان، وه سەرچاوەی حەسودەکانن، ئەوان گەل و هۆزن، وه تاقم و گروپن . ئێمه ئێستا هەندێك له ناوەکانیان وه کۆمەڵێك له ڕەوشتیان باس دەکەین، لەبەر ئەوەی ئەوان کتێبانێکیان هەیه که بڵاوبۆتەوه، وه قسەکانیان لەناو خەڵکی بڵاوبۆتەوه،

كه هەموو خەڵكی نازانێت ئەو قسانە، وە كۆمەڵە حدیثێكیان بڵاو كردووەتەوە كه ماناكەی شاراوەیە لەلای زۆرێك لەو كەسانەی دەیخوێننەوە، وە لەوانەیە تێبكەون بە قسەی ئەو كەسانەی خاوەنی ئەم قسانەن كە سەرەتای كتێبەكانیان بە سوپاس و ستایش وە حمدی الله دەستپێدەكەن، وە دواتر سەڵاوات لەسەر رسول الله ﷺ لێ دەدەن، پاشان كوفرەكانیان بە وردی دادەنێن، وە داهێنان و شەڕەكەیان شاراوە دەبێ، هەندێك كەس ئەوانەی كە زانیاریان نییە وە ئەوانەی كە ئەعجەمین لە خەڵكی وا دەزانن ئەم كتێبە دانراوی زانایەكە لە زاناكان، یان فەقیهێكە لە فوقەهاكان، لەوانەیە بتپەرەستی بڵاوبكاتەوە لەناو بیروباوەری ئەم ئوممەتەیە، وە ئەو كەسەی وای پیشان دەدات كە دۆستی اللَّه بەڵام لە بنەرەتدا دۆستی شەیتانە.

٥٤٦ . لە سەرە پێشەواكانیان لە گومرای، لەوانن : جهم بن صفوانی گومرا و گومراكەر.

٥٤٧ . وە دەڵێن ئەو لە الشام بووە پێیان ووتووە چیت دەوێ؟ ووتوویەتی : بەدوای ئیلاهێك دەگەڕێم بۆ ئەوەی بیپەرەستم . كۆمەڵێك گومرایەكی زۆریش لاسایی قسەكەی ئەویان كردووەتەوە.

٥٤٨ . ابن شوذب رحمه اللَّه دەڵێ : چل رۆژ وازی لەنوێژ هێنا لەبەر ئەوەی گومانی هەبوو.

٥٤٩ . لە كۆمەڵەكەی ئەو وە شوێنكەوتووەكانی :
بشرٌ المرِيسيُّ، المُردارُ، وأبو بكرِ الأصمُّ، وإبراهيمُ بن إسماعيلَ ابنُ عُليَّةَ، وابنُ أبي دؤادِ، وبرغوثُ، وربالُويه، والأرمَنيُّ، وجعفرُ الحذَّاءُ، وأبو شُعيبِ الحجَّامُ،

وحسنُ العطَّارُ، وسهلٌ الخرَّازُ، وأبو لقمانَ الكافِرُ، کۆمەڵێك گومرای تر لە گروپەی ئەمان.
هەموو زاناكان دەڵێن لە ئەوانەی كە ئێمە ناومان هێنان ئەمانە هەموویان پێشەوایانی كوفر وگومراین.

٥٥٠. وە هەروەها لە پێشەواكانیان لە هاوەڵانی قەدەرن : معبدٌ الجُهميِّ، وغَيلانُ القدريُّ، وثُمامةُ بنُ أَشرَسَ، وعَمرُو بنُ عُبيدِ، وأبو الهُذيلِ العَلَّافُ، وإبراهيمُ النَّظَّامُ، وبِشرُ بن المُعتمِرِ .
وە کۆمەڵێكی تر هاوشێوەی ئەمان لە كوفر و گومراین . وە ئەوانیش : محمد بنُ عبدِ الوهَّابِ الجُبَّائيُّ، وأبو العنبسِ الصَّيميريُّ.

٥٥١. وە لە الرافضة : المُغيرةُ بنُ سعيدِ، وعبد اللَّه بنُ سَبأِ، وهشامٌ الفوطيُّ، وأبو الكرَوَّسِ، وفُضيلٌ الرَّقاشيُ، وأبو مَالكِ الحضرميُّ، وصالحُ قُبَّة .
ئەوان زۆر لەوە زیاترن كە لە كتێبێك ناوی هەموویان بنوسرێت، یان بە خوتبەیەك ناوی هەموویان بهێنرێت.

٥٥٢. کۆمەڵێك لە سەركردەكانیانم باسكرد، بۆ ئەوەی واز لە قسەكانیان بهێنرێت لەلای ئەو كەسانەی زانیاریان نییە، وە دانەنیشتن لەگەڵ ئەو كەسانەی قسەكانی ئەوان دەڵێنەوە، وە گفتوگۆ دەكەن بە كتێبەكانیان.

٥٥٣. وە لە پیسەكانیان ئەوانەی كە قسەكانیان دژی سوننەتە، وە سەرخەری دژی سوننەتە، وە قسەكانیان لە پیسترین قسەكانە . ابنُ كُلَّابِ، وحُسينٌ النجَّارُ، وأبو بكرِ الأصمُّ، وابنُ عُليَّةَ.
الله ئێمە وە ئێوە بپارێزیت لە قسەكانیان وە لە شەریان وە مەزهەبەكەیان، بمان

ژێنێت ئێمە و ئێوە لەسەر ئیسلام و سوننەت، وە لەسەری بمان مرێنێت، وە لەسەر ئەوە حەشرمان بکات، وە بێگومان نیعمەتەکانی و فەزڵی دەدات بەسەرمان، وە وەعدە جوانەکانی لەگەڵمان دەباتە سەر، اللّٰه ئێمە و ئێوە لەوانە بگێرێت کە سنوورەکانی دەپارێزیت وە دەوەستن لەسەر سنوورەکانی، وە سود بگەینێت بە ئێمە و ئێوە بەو کردەوانەی کە کردوومانە، وە کردەوەکانمان بکاتە کردەوەی چاك کە قەبوڵی دەکات و پێیان رازیە، وە ئێمە و ئێوە حەشر بکات لە کۆمەلەی رسول اللّٰه وە هاوەڵەکانی، سوپاس و ستایش بۆ اللّٰه لە سەرەتا و کۆتایی، وە سەلاوات لەسەر ﷺ لەناخەوە وە بە زمان .